پەیامەکانی ڕێنوێن بۆ گەنجان (٣٠)

# داروین

## لە تەرازووی ژیرییدا

نوسینی :
مامۆستا موحەممەد مەلا ساڵحی شارەزووری

زنجیرە پەیامەکانی گۆڤاری ڕێنوێن ژمارە (٣٠)

📖 ناوی کتێب: داروین لە تەرازووی ژێریدا
✍ نوسینی: موحەممەد صالح ئەبوبکر شارەزووری
🖊 ناوی زنجیرە: زنجیرەی بابەتە فیکرییەکان

* ژمارەی زنجیرە: ٧
* تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
* نۆبەی چاپ: دووەم
* ساڵی چاپ: ٢٠١٥
* ژمارەی لاپەڕە: ١٩٠ لاپەڕە
* دیزاین: گۆڤاری ڕێنوێن
* پێداچونەوەی: کۆچەر محمد مەلا صالح
* چاپ: چاپخانەی ڕێ نوێ
* نرخ: تەنها (٤٠٠٠) دینار
* سەرپەرشتیکار: سەرکۆ کریم احمد
* ئیمەیڵ: renwen2009@yahoo.com
* ماڵپەڕ: www.aubyc.com

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٤٢٢)ی ساڵی ٢٠١٤ ی پێدراوە

(ئەم بەرهەمە تەعبیر لە بۆچونی نوسەر دەکات)

**خوای گەورە دەفەرمێت:**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ مَّآ أَشْهَدتُّهُمْ خَلْقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَا خَلْقَ أَنفُسِهِمْ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلْمُضِلِّينَ عَضُدًا ﴾

﴿ **سورة الكهف** (٥١) ﴾

**خـەوێـك :**

لـه خەومـدا... لـه خـەوێکی دوور و درێـژی شـەوانی ژیانمـدا، وامزانی له ساڵی (١٩٦٨)ەوە ژنم هێنـابوو، هـەتا ساڵی (١٩٧٨) چاوم بـه زەردەخەنـەی منـاڵێکم نەگەشـایەوە و ماڵـه چـۆڵەکەم هیچی له ماڵ نەدەچوو، بۆیە هەر لەو خەوەمدا دۆست و برایان . خێزانەکەشم . کەوتنه سەرو خوارم که ژنێکی تر بهێنم.

بـەڵێ، منـیش ڕۆژی (١٩٧٨/٣/١٩) ژنم هێنـا و کەچـی ئـەویش هـەر نـاوی (مینـا) بـوو، مـن پێمئـەوت: (هـودا)... لـه خەوەکەمـدا کچە هەورامییەکی ڕدسـەنی دڵپاکی دەروون پاکی خۆشەویستی دڵ و دەروون بـوو، بــه دەگمــەن پیـاو ڕێـی لــه ئـافرەتی وا دەکـەوێت.. هـەر لـەو خـەوەمدا ئاسـۆی منـاڵبون دەرکـەوت، هـەتا ڕۆژی (١٩٨٠/١١/٢٧) مناڵەکـه تاقـه دوو مـانگی مـابوو ( ئـەنگا، ئەنگا ) ماڵەکەمان ئاوەدان بکاتـەوە، من لـه خەوەکەمـدا . دوور بـێ لـه ڕووتـان سـەرنگون بـووم . کـاتێ ڕۆژی (١٩٨١/٦/٢٠) سـەرم هێنـایـەوە و هـەواڵی ژن و منـاڵم پرسـی؟ وتیـان: "هـەیهوو، هـەر ڕۆژی (١٩٨١/١/٣٠) کاتـژمێر ١٢.١٨ دەقیقـەی نیـوەڕۆی هـەینی (هوداخان) لە تەمەنی بیست ساڵیدا بە خۆی و مناڵەکەتانەوە کۆچیان گواستەوە بۆ گۆڕستانی (ملەگای چنار) لە بیارە..."؛ کە سەیرم کرد، کوڕە خۆ ئەمە خەو نییە و ڕاستییە... منیش هیچـم دەسـەڵات نـەبوو ئەوەنـدە نـەبێ، خێـری نووسین و خـۆ

مانـدوکردن لـەم کتێبـەدا بکەمـە دیـاری بـۆ گیـانی ڕەوانـی (هوداخان) لە بەهەشتی بەریندا و بڵێم: ئەی هەزاران ڕەحمەت لە گۆڕت ژنەکە، بە خوا ئافرەتێکی چاك بویت و خوا لە باتی من بە بەهەشت پاداشتت بداتەوە و ( إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّـا إِلَيْهِ رَاجِعونَ ).

موحەممەد مەلا ساڵحی شارەزووری

سلێمانی گەڕەکی شەهیدان

٨/ڕەمەزانی/١٤٠١کۆچی

٩/تەمموزی/١٩٨١ زاینی

## پێشکەشە :

* بەو گوێیانەی لە دوورەوە چاوی دڵم لێیانە .

* بەو مرۆڤەی حەزدەکات ڕۆڵەی پێغەمبەرێك بێت .

* بەوەی گوێ ناداتە حەپەی لاڕێ .

## تەرازووی ژیری:

نەورەسی[1] و بەهەشت، کوڕ و کچی موسڵمانێکی دراوسێمان بون لە ناو خۆیاندا کەوتنە گفتوگۆ :

بەهەشت: ئەریّ کاکە نەورەسی گیان، ئەوە پێم ناڵێی مامۆستا شارەزووری خەریکی چییە؟ نابینی چاویلکەکانی ئەخاتە سەر لوتی و خرتەخرت چاوەکانی لەو دیوی شووشەی چاویلکەکانییەوە هەڵئەسوڕێنێ بەسەر ئەم کاغەزانەدا و (١٠-١٥) کتێبی بە چواردەروری خۆیدا بڵاوکردووەتەوە و هەر جارەی زمان لە بنی یەکێکیان ئەسوێ و لێی دەچێژێ و دەست دەکاتەوە بە نووسینەکەی خۆی، کە سەیری ئەو دەفتەرانەی ژێر دەستی دەکەم، هەموویان (تەرازووی ژیری)ن، ( مارکس لە تەرازووی ژیریدا، داروین لە تەرازووی ژیریدا، فرۆید لە تەرازووی ژیریدا ) ؟

نەورەسی: خوشکە بەهەشت تەرازووی ژیری ئەو زنجیرەیە مامۆستا دەیەوێ کاکڵەی بیروباوەڕی مادییەت و مامۆستاکانیان بەم تەرازووە بکێشێ و هەر یەکەیان و بیروباوەڕەکانیان، کێشی راستەقینەی خۆیان و مافی خۆیان

---

[1] لە خۆشی و بۆ زیندوکردنەوەی ناوی پاڵەوانی ئیسلام پەروەری کورد مامۆستا (بدیع الزمان: سەعید نەوڕەسی) ئەم کوڕە ناونراوە: نەوڕەسی.

بداتێ و جێگای شیاوی خۆیان دیاری بکات، جا به‌هه‌شت گیان ئه‌ڵقه‌ی یه‌که‌م و دووه‌می ئه‌م زنجیره‌یه به ناونیشانی ( ڕێکه‌وت له ته‌رازووی ژیریدا و سروشت له ته‌رازووی ژیریدا ) به چاپ گه‌یاند و یه‌که‌میان له چاپکراوه‌کانی (کۆڕی زانستی کورد) بوو له سالّی (١٩٧٦)دا چاپکرا، دووه‌میان له ساڵی (١٩٧٧)دا له چاپخانه‌ی (الدار العربية) له به‌غدا و له‌سه‌ر ئه‌رکی خێرۆمه‌ندێك به ناوی مامۆستا (صدیق گه‌لاڵی) به چاپ گه‌یاند، به‌ڵام ئه‌ڵقه‌ی سێیه‌می زنجیره‌که (مارکس له ته‌رازووی ژیریدا) به پرشوبڵاوی ئاخنییه نێو باسه‌کانی کتێبی ( ئیسلام و شارستانییه‌تی مادده‌یه‌ت )، که ئه‌م باسه‌ی من و تۆش به‌شێکه له‌و کتێبه، ئه‌ڵقه‌ی چواره‌م و پێنجه‌می زنجیره‌که‌ش ئه‌وه‌یه که من بڕیارمدا بۆ تۆی باس بکه‌م و وتووێژه‌که‌ی من و تۆش مامۆستا بڕیاریدا بیکاته نووسین و بیکاته ئه‌ڵقه‌کانی زنجیره‌که له لایه‌که‌وه، له لایه‌کی تره‌وه به‌شێکی گرنگی کتێبی ( ئیسلام و شارستانییه‌تی مادده‌یه‌ت ).

جا به‌هه‌شت گیان، ئه‌وه‌بوو وتمان: "وه‌ك مامۆستا له کتێبی ناوبراودا ده‌ستنیشانی کردووه" شێوه‌ی بیرکردنه‌وه و نه‌خشه‌کێشانی ژیرێتی هه‌ر شارستانییه‌تێك به‌رامبه‌ر به ( خوا، بونه‌وه‌ر، مرۆڤ.... ژیان و ئامانجه‌کانی ژیان) ڕێژه‌ی پشوودانی

دەروونـــی و بـــەختیاریی تاکـــەکانی ژێـــر ســـایەی ئـــەو شارستانییەتەمان بۆ دەستنیشان دەکات.

بەهەشت: وایە، ئەوەبوو لە بەشی یەکەمی کتێبەکەی مامۆستادا (بەشی بیروباوەڕ. العقیدة) مامۆستا هەڵوێستی شارستانییەتی ماددیەت و شارستانییەتی ئیسلامی بەرامبەر بە بونی خوا و کاریگـەریی ئـەو بـاوەڕە لەسـەر کۆمـەڵگا و تاکـەکانی هـەر شارستانییەتێك باس کـردووە، خـۆ بونـەوەریش لـە ڕوانگـەی ئیسلامەوە دروستکراوی خوایە و بە فەرمانی خوا هەڵئەسوڕێ.

نەورەســی: زۆر ڕاسـتە بەهەشـت گیـان، ئەمێنێتـەوە مـرۆڤ، ئـەو گیانـداره بلیمەتـەی ئـەم سـەرزەوییەی ئاوەدانکردووەتـەوە وژیانێکی ئەفسانەیی بۆ خۆی پێکهێناوە، جا سەیرکردنی مرۆڤ و نرخانـدنی مـرۆڤ لـە هـەر شارسـتانییەتێکدا ڕوانگەیـەکی دیـاریکراوی خـۆی هەیـە و نەخشـەی هەڵسـوکەوت و ڕازەکـانی دەروونی مرۆڤ دیاری دەکات.

بەهەشـت: کاکەگیان، وا بزانم لە شارستانییەتی ماددییەتدا، بە هـەردوو بەشـەکەیەوە (بەشـی ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوا)، سـەربازگەی کۆمۆنیستی، یان سەرمایەداری) مرۆڤ بریتییە لەو مرۆڤەی لە کارگـەی بیردۆزیـی و تیۆرەکـەی (داروین)دا دەرچـووە، بۆیـە حەزدەکەم ئەگەر بە پەلەیش بێ، کاکەگیان، کاکڵەی ئەم تیۆرەم بۆ باس بکەیت و دواجار بۆم هەڵبسەنگێنی، هەرچەندە وا بزانم

(داروین) نە خۆی خاوەنی ئەم تیۆرەیە و نە ئەم تیۆرەش وەك کاتی (داروین) ماوەتەوە.

ئەورەسی: نەخێر بەهەشت گیان، داروین خاوەنی ئەم بیردۆزە نییە و بەسەدان ساڵ پێش لەدایکبونی داروین زاناکانی خۆمان باسی (تیۆری داروین)یان راستتر بڵێین (بیردۆزی پەیدابون و گەشەکردن)یان کردووە، تەنانەت هەر لە ئەورووپای داروینـدا (لامارك و بۆفۆن)ی فەرەنسی بە دامەزرێنەر و مامۆستای تیۆرەکە ئەژمێررێن[٢]، بەڵام کاتێ داروین هات و گەشتەکەی سەر کەشتی (بیگڵ)ی کرد بە شێوەیەك پاڵی نا بە تیۆرەکەوە، هەتا لە سەر خۆی تاپۆی کرد و مۆری داروینی پێوەنرا، خۆ پاش مردنی داروین و لەم ساڵانەی دواییدا، کاتێ داروینیزمەکان و قوتابیانی قوتابخانەی داروینی، سەیریان کرد وا زانستە نوێکانی وەك ( بایۆلۆجی و فسیۆلۆجی) کەلێنێکی گەورەیان خستۆتە داروینی، ئەمانیش هەڵسان بە سمارتەلێدان و کلك و گوێکردنی داروینی و پڕکردنەوەی کەلێنەکان، بەڵام بەهەشت گیان هەر کە ئەمان کەلەبەرێك دەگرن لە لایەکی ترەوە کەلەبەرێکی گەورەتری تێدەبێ، جا بەم پینە و پەڕۆکردنە ئەوتریێ داروینی نوێ.

---

[٢] سەیری کتێبی (الانسان قمة التطور) نووسینی نووسەری ماسۆنی شلێمۆ موشێکە خۆی ناوناوە (سلامة موسى)، ل٤١ بکە.

بەهەشت: دەی کاکەگیان داروین چی دەڵیت: هەڵوێستی زانستی تازە بەرامبەر داروین و هەڵوێستی ئیسلام چییە ؟ و بۆچونی زاناکانی ئیسلام ( زانا و پێشەواکانی خۆمان ) چییە ؟

نەورەسی: بەهەشت گیان، داروین خوا بۆی ڕێکخست و بووە یەکێك لە تاقمەکەی کەشتی (بیگڵ)ی جەنگی بەریتانی، کە ئەو کاتە داروین نە بە زانایەکی سروشتزانی، یان زیندەوەرناسی، یان مامۆستایەکی دیار نەئەناسرا، بەڵکو هەلێکی زێڕین بوو دەستیکەوت[٢].

بەڵێ داروین لەساڵی (١٨٣١) هەتا پایزی (١٨٣٦) گەشتێکی زانستی و چاوخشاندنێکی وشکانیی و دەریایی و کەنارەکانی دەریاکانی کرد و چەند تێبینییەکی سەرەکی دەستکەوت و لای خۆی تۆماریکردن، کە ئەم خاڵانەی خوارەوە کاکڵەی دەستکەوتی گەشتەکەیەتی:

* ژیان، هەموو زیندەوەرێك ئەسازێنێ و ئەگونجێنێ و ئەینەخشێنێ لەگەڵ (دەوروبەر)ەکەیدا، مرۆڤی ناوچە تەوەرییەکان قەڵەو و چەورن و بۆ ئەوەی بەرگەی سەرما و سۆڵەی ئەو ناو بەستەڵۆکەییە بگرن، هەروا ورچەکانی ئەم ناوچەیە داپۆشراون بە پاڵتۆیەکی خوری تیسکن، کەچی مرۆڤی

---

[٢] سەیری پێشەکیی کتێبی (اصل الأنواع) و نامەکەی مامۆستا (هەنسلۆ) بۆ داروین، ل٧٣ بکە.

(ناوچـەی کەمـەرەی زەوی) لـەڕ و لاواز و ڕەشـن، بـۆ ئـەوەی بەرگەی تیشکی خۆری سوتێنەری ئەو ناوچەیە بگرن، هەروا ورچەکانی ئەم ناوچەیە لەڕ و لاواز و بێتوك و ڕەشن.

* مارمێلکەی ئەشکەوتە تاریکەکان هەموویان کوێر و سادە و بێڕەنگن، چونکە جێگاکەیان تاریکە و پێویستیان نە بە چاو و نـە بـە ڕەنـگ نییـە، بـەڵام مارمێلکـەی دەشـتەکان چـاو تیـژ و ڕەنگاوڕەنگن.

* خـۆ دەم ودەنـووك و قـەپۆز و لمـۆزی هـەر گیانـدارێك لەگـەڵ پێویستی خۆیدا گونجاوە، هەندێ دەم و ددانی تیژ و بڕەرە وەك پڵنگ، هەندێکی تر دەنووکی درێژ بۆ چینەی ناو لم و زیخ، وەك لەقلەق، یان کورتە وەك چۆلەکە، هەندێکی تر لمۆزێکی تیـژ بـۆ چەقاندن، وەك مێش و مێشولە، گەلێ تێبینی و سەرنجی تر لەم بارەوە.

بەهەشـت: کاکـەگیان وابزانم داروین لای وابوو بناغـەی هـەموو ڕووەکـەکان و گیانـدارەکان (یـەك سـێڵ ، خانـە)ی زینـدوو لـە یەکخانەیی (وحيدة الخلية)ێك دروستبووە.

نەورەسی: بەڵێ، بەهەشت گیان، ئەم تێبینی و سەرنجانە و چەند توێژینەوەیەکی تر کە دوایی باسیان ئەکەین، پاڵی بە داروینەوە نا بڵێ: ئەم زیندەوەرانە هەر هەموویان لە بناغەدا یەکبون و لە

دوایـیـدا بەپێی ئەو یاسایەی داروین باسـی دەکات پەل و پۆی جیاکردەوە و ئەم دیمەنەی ژیانە دروستبوو.

**بەهەشت:** ها...ها، واتە جگە لەوەی (بەپێی تیۆری داروینی) مرۆڤ ئامۆزا و پورزا و خاڵۆزای گیاندارەکانە؟ ڕەنگە باپیرەگەورەمان لەگەڵ گیای سێپەڕەدا، یان دار گوێز یەك بگرنەوە؟!!

**نەورەسی:** بەڵێ، وایە بەهەشت گیان، بەڵام پێش چەند ژمارە ساڵێکی خەیاڵی، کە خەریکە لە پلەی ژێری مرۆڤ بچێتە دەرەوە (لای داروین) گیاندار و ڕووەك جیابونەوە و گیاندارەکانیش هەر یەکە بە پێی بارودۆخی ژیانی و دەوروبەری، خۆی سازاند، ئەو گیاندارانەی بەرەو وشکانی هاتن قاچیان لێ ڕووا بۆ ڕۆشتن، ئەوانەی بەرەو دەریاکان ڕۆشتن (لە ئاودا مانەوە) قاچەکانیان بوو بە پەڕەکە بۆ سەوڵ لێدان، خۆ ئەوەش لە (هێزی ئاسمانی) بوو، ئاسمان و فڕینی هەڵبژارد، وا ئەرزە و حاڵێکی (سکالانامە) نووسی بۆ کارگە و دەستەکانیان بۆ کرد بە باڵ بۆ فڕین.

**بەهەشت:** کاکەگیان وابزانم لەیەکچوون و نزیکبوونی کۆئەندامەکانی گیاندارەکان زیاتر داروینی هان ئەدا بۆ سووربون لەسەر تیۆرەکەی؟

**نەورەسی:** بەڵێ، بەهەشت گیان، وابوو، داروین دەڵێت:[٤].

---

[٤] سەیری کتێبی (اصل الأنواع) نووسینی داروین و گۆڕینی بۆ عەرەبی (اسماعیل مظهر) و کتێبی (القرآن محاولة لفهم عصري) و (حوار مع صديقي

(مار) کە بە ڕواڵەت سەیر ئەکەیت قاچی نییە و بێ پێیە، کەچی کاتێ ئەیخەینە ژێر نەشتەری توێکردن، ئەبینین لە پەیکەری ئێسکی ماردا جێگای چوار پەلی شاراوە دیارە، ئەو پەڕەی لە ماسیدا بە دی دەکەین هەمان چوار پەلی مرۆڤ و زیندەوەرەکانی ترە، سەیری دەست و پێی مرۆڤ دەکەین هەر یەکەیان پێنج ئەنگوست (پەنجە)ی هەیە، هەروەها مەیمون، پێنج پەنجە و مشك پێنج پەنجە و مارمێلکە پێنج پەنجەی هەیە، دڵ و شێوەی سوڕانی خوێن، مرۆڤ و مەیمون و شەمشەمەکوێرە وەك یەکن، هەمان تیشوو، تەنانەت دڵ، هەمان چوار ژوور، هەردوو سکۆڵە و هەردوو گوێچکەلە، کۆئەندانی دەمار(عصبی) هەرلە مۆخ و درکە پەتك(داوی شەوکی) و ڕەگەکانی هەست، داوەکانی جموجوڵ لە هەموو گیاندارەکاندا هەمان ئامێرن..

ماوەی سك پڕبون و مناڵبونی مرۆڤ (٩) مانگە و مەیمونیش (٩) مانگە و (نەهەنگەکان (٩) مانگە، تەنانەت ماوەی شیرخواردنی کۆرپەی هەر یەکەیان دوو ساڵە.

سەرنجێکی تری داروین ئەوەبوو کاتێ سەیری پشت کۆمی مرۆڤ ئەکرێت، جێگای (کۆنە کلکێك) ئەبینرێت، زانستی یەکالاکردنەوە (توێکردنەوە) پێمان دەڵێت: لەو جێگای کۆنە

---

الملحد)ی د. مستەفا مەحمود و کتێبی (اضواء من القرآن علی النسان ونشأة الکون والحیاة) عەبدولغەنی خەتیب بکە.

کلکەدا بە ئەندازەی بڕگەی کلکی مەیمون بڕگەی شاراوە و لکاو بەدی ئەکرێت، پێمان دەڵێت: بڕگەی گریێ ملی مرۆڤ حەوت بڕگەیە و کەچی گریێ ملی ماینەبەحری (زەڕافە) بەو مل درێژییە . هەر حەوت بڕگەو، گرێی ملی ژیژك (ژووژوو) بەو مل کورتییە، هەر حەوت بڕگەیە، سەرنجێکی تری داروین ئەوەبوو دەیگوت : "کۆرپەلەی مرۆڤ لە سکی دایکیدا (مندالّداندا)شێوەی دروستبون و پەیدابون و نەمانی هەندیێ لە پارچەکانی لاشەی، لە سەرەتای پەیدابونی کۆرپەلەکە وەك ماسی وایە، تەنانەت کەوانەی ڕیشەداریشی هەیە، پاش ماوەیەك هەست ئەکرێت بە پەیدابونی کلك و ماوەیەك دوای ئەوە کلکەکە ون دەبیێ و نامێنیێ، ئەمجارە وردە وردە لاشەی کۆرپەکە بە موویەکی نەرمی تیسکن دائەپۆشرێت (وەکو کۆرپەی مەیمون) پاش ماوەیەکی تر توکەکەیشی نامێنیێ، تەنها لەسەر سەری نەبیێ، بە کەمی ئەمێنی"[٥][١١٧].

---

[٥] بڕوانە: (نظرية التطور واصل الأنسان) شلێمۆ موشیێ، ل٧٥.

## بـەڵگەی داروینیزم:

**بەهەشت:** جا کاکەگیان ئەمانە چەند سەرنج و تێبینییەکن، ئەمانە لە کوێ وئەم هەموو گاڵەگاڵەی داروینیزمی ئەمڕۆ لە کوێ ؟

**ئەورەسی:** بەهەشت گیان، داروین و داروینیزم تەنها بەو سەرنج و تێبینییانـەوە نەوەسـتاون، بـەڵکو هەسـتان بـە دانـانی چـەند یاسایەکی بە خەیاڵی خۆیان زانستی، کە ئەو یاسایانەش:

١. زۆرانبازی بۆ مانەوە ( الصراع من أجل البقاء ).

٢. یاسای هەڵبژاردنی سروشتی ( الانتخاب الطبيعي ).

٣. خۆسازدان لەگەڵ دەوروبەردا ( الملائمة مع البيئة ).

٤. یاسای بنەما و بازدان ( الوراثة والفطرة ).

**بەهەشـت:** مەبەسـتی داروینیـزم لـەم بەڵگانـە چییە ؟ ئایا هـیچ بەڵگەیەکی زانستی بە دەستەوە هەیە ؟

**ئەورەسـی:** داروینـی، بەڵگـە بـە هەنـدێ زانسـت ئەهێنێتـەوە، جا بەهەشت گیان ئەتەوێ لە پێشدا باسی یاساکانی داروینیـزم لـە بارەی تیـۆری (پەیـدابونی ژیـان و گەشـەکردنییەوە)ت بـۆ بـاس بکەم، یان بەڵگە زانستییەکانی داروینی باس بکەین.

**بەهەشت:** لە سەرنجەکانی (داروین)ەوە کەمێك لە مانای یاساکانی داروینی تێگەیشتم، لەبەرئەوە حەزدەکەم بەڵگەکانی بخەینە ژێـر توێژینەوە و دوا جاریش یاساکانمان لە دەست دەرناچێت.

**ئەورەسی:** بە چاوان بەهەشت گیان.

بەهەشت گیان، ئەو بەڵگانەی کە داروینیزم کردویانە بە بەڵگەو بۆنی زانستی لێدیٚ:

یەکەم: بەڵگەی زانستی ساواناسی (کۆرپەلەناسی)، لای داروینی ئەو قۆناغانەی ساوا لە منداڵدانی دایکیدا ئەیبڕێت و ئەو گۆڕاندنەی شێوەی کۆرپەکە (وەکو لە پێشەوە باسمان کرد) دەبێتە پاڵپشتێك بۆ سەلماندنی وتەکانی داروین لە بارەی گەشەکردنی مرۆڤ لە شێوەی گیاندارەکانی ماسی و گیاندارە چوار پێکانی تر و مەیمون بۆ مرۆڤ، داروینیزم دەڵێت ئەگەر بەراوردێك بکرێت لە نێوان کۆرپەی مریشك، یان ماسی، یان مەیمون لەگەڵ مرۆڤدا لە قۆناغی سەرەتایی دروستبونیدا، هیچ جیاوازییەك بەدی ناکرێت.

**بەهەشت:** ئەی کاکەگیان تۆ بۆچونت بەرامبەر بەم بەڵگەیە چییە؟

**نەورەسی:** وەڵڵا خوشکە گیان، من دەڵیم:

١. ئەو هەموو بەڵگانە داروینیزم دانی لیٚ چیڕ دەکاتەوە و شەن و کەوی دەکات، نابێتە بەڵگەی ئەوەی بناغەی ئەم گیاندارانە یەك بن، بەڵکو تەنها ئەبنە بەڵگەی (لەیەکچوون)ی کۆرپە، لەیەکچوونی کۆمەڵی دروستکراو مانای (گەشەکردنیان لە یەکتری نابەخشیٚ، بەڵکو یەك دروستکەر (خالق) ئەبەخشیٚ.

٢. بەهەشت گیان، ئەم بەڵگەی داروینییە بەڵگەیەکی زانستی نییە، چونکە ئایا ئەگەر گەرایەکی ماسی بهێنین و بە ڕێگەی

چاتکردنی دەستکرد (التلقیح الصناعی) بیخەینە منداڵدانی ئافرەتێکەوە، ئایا (بەو پێیە گەرای ئادەمیزاد لە منداڵدانی ئەو ئافرەتەدا بە قۆناغی ماسیدا تێپەڕ دەکات) ماسی دروست دەبێ؟ ئایا ئافرەتەکە ماسیی دەبێ ؟

بەهەشت: نەوەڵڵا کاکە چۆن ئافرەت ماسیی دەبێ!!

نەورەسی: کەواتە ئەو شێوە و (لێکچوونە) نابێتە بەڵگەی گەشەکردنی مرۆڤ لە ماسی.

بەهەشت: ئەی بەڵگەیەکی تری داروینیزم ؟

نەورەسی: بەڵگەی دووەمی داروینی، زانستی شوێنەوارزانی (علم الحفريات بايولوجيا)یە.

داروینی دەڵێ: ئەگەر زانایەکی جیۆلۆجی کەشماڵ (مسح)ێکی چینەکانی ژێر زەوی بکات (تەنە بەبەردبوو ـ متحجرات)ەکانی ڕووەك و ئاژەڵ و هەموو گیانداەرەکانی تر و مرۆڤی دەستدەکەوێ، کە لە ئاسانترین گیاندار و (ڤایرۆس) زیندەوەرەوە دەستپێدەکات، هەتا مرۆڤ[٦]، زاناکە هەتا زیاتر ڕۆبچێ بە زەویدا بەبەردبووی گیانداری کۆنتر، یان بنەبڕ (منقرض) بە دی دەکات، کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ لەگەڵ تەمەنی زەویدا و بە پێی چینە جیۆلۆجییەکانی توێکڵی زەوی

---

[٦] بڕوانە، (الدين في مواجهة العلم)، وحيدالدين خان، المختار الاسلامي، ساڵی ١٩٧٤ چاپی سێیەم، قاهیرە، ل١١.

هەر چینەی کۆمەڵە زیندەوەرێکی هەڵگرتووە، دواکەوتووتر لە چینی داهاتوو پێشکەوتووتر و نزیکتر لە گیاندارانی ئێستا لە چینی رابردوو.

**بەهەشت:** باشە کاکە، چۆن ئەو چینانەی توێکڵی زەوی ئەزانرێت؟

**نەورەسی:** چاوەکەم، زانا جۆلۆجییەکان توێکڵی زەوی (القشرة الأرضية) بەش ئەکەن بە سیانزە چینی جیۆلۆجییەوە، ئەم سیانزە چینەش بە پێنج قۆناغی ڕۆژگاریی و کاتیدا تێپەڕی کردووە، کە ئەوانیش[٧]:

١. ڕۆژگاری کۆن (الدهر القديم).

٢. ڕۆژگاری یەکەمین (الدهر الأول).

٣. ڕۆژگاری دووهەمین (الدهر الثانوي).

٤. ڕۆژگاری سێیەمین (الدهر الثالثي).

٥. ڕۆژگاری چوارەمین (الدهر الرابعي).

ئەم کۆمەڵە ڕۆژگارانە، کە هەریەکەیان لە چەند چینێك پێکهاتوون، هەر یەکەیان کۆمەڵە گیاندارێکی بە بەرد کردووە و هەڵیگرتووە، بۆ نمونە: هەرگیز لە چینەکانی ڕۆژگاری یەکەم، یان دووەم، یان سێیەمدا شوێنەواری مرۆڤ بە دی ناکرێت و ئەم

---

[٧] بڕوانە: (نظرية التطور وأصل الإنسان) شلێمۆ موشێ (سلامة موسى).

چین و ڕۆژگارانە بونەتە تاق و ڕەفە بۆ هەڵگرتنی لە ئاسانترین و کاڵ وکرچترین گیاندار هەتا مرۆڤ، کە ئەمەش مانای ڕاستی و سەلماندنی تیۆری (پەیدابون و گەشەکردنەکەی داروینی) ئەبەخشێت، جگە لەوەی کە جارجار کەللە سەر دەدۆزنەوە (یان وێنەی خەیاڵی کەللە سەر ئەکێشن)، کە نەکەللە سەری مرۆڤە و نەکەللەی مەیمون، بەڵکو لە نێوان هەردو کەللەی هەردوکیاندایە.

**بەهەشت:** ئەی تۆ دەڵیی چی؟

**نەورەسی:** من بڵێم چی، دەڵیم:

١. ئەو کۆمەڵە ئێسکە ڕزیوانەی تا ئێستا چونەتە ئەزمونگەری (جیۆلۆجیا)وە، بەس نییە بۆ دەستکەوتنی ئەنجامێکی ڕاستیی و گشتی، ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە تا ئێستا کەشماڵێکی گشتی زەوی نەکراوە، ڕەنگە مرۆڤی یەکەم و (تەواو) لە شوێنێك ژیابێ تا ئێستا پەنجەی زاناکانی جیۆلۆجی بەرنەکەوتبێ.

٢. تا ئێستا نە داروین خۆی و نە داروینیزمی تازە نەیانتوانیوە تەمەنی پەیدابونی یەکەم مرۆڤ دیاری بکەن، چونکە هەتا کەشماڵێکی جیۆلۆجی (المسح الجیولوجی) پەرەبسێنێ زیاتر کون و کەلەبەر دەکەوێتە داروینیزم.

بۆ نمونە: کاتی خۆی داروینیزم تەمەنی مرۆڤی کۆنی دائەنا بە (٦٠٠) هەزار ساڵ، بەڵام پاش ئەوەی پشکنینی جیۆلۆجی فراوانتر بوو بۆیان دەرکەوت ئەو تەمەنە بۆ مرۆڤ ڕاست نییە.

گۆڤاری (العلوم)ی لوبنانی[٨] بڵاوی کردەوە کە (د.ئۆڵداڤی جۆرج) کەللەسەرێکی مرۆڤی لە (ئەنجەنیکا) دۆزییەوە و بردیەوە بۆ زانکۆی (کالیفۆرنیا) پاش لێکۆڵینەوەیەکی زانستی چڕ و پڕ بۆیان دەرکەوت کە تەمەنی ئەو کەللەسەرە زیاترە لە (ملیۆنێك و حەوت سەد و پەنجا هەزار ساڵ)ە، جا ئەگەر داروینی تەنها لە تەمەنی مرۆڤدا ئەوەندە کەلێن دروست بکات، خۆ لە چۆنێتی دروستبونەکەیدا کەلێنەکە گەورەتر دەبێ.

٣. دواکەوتنی دروستبونی مرۆڤ لە دروستبونی گیاندارەکانی تر شتێکی ڕوونە و نەپێویست بە فەلسەفەی داروینی دەکات و نە دەبێتە بەڵگەی تیۆری داروینی، چونکە زۆربەی ژیانی مرۆڤ بەستراوە بە بونی ئەو گیاندارانەوە و ئەوەش کە مرۆڤی دروستکردووە زیاتر لە هەموو کەس پێویستییەکانی مرۆڤ ئەزانێ و دروستبونی دواخستووە.

٤. بەپێی کەشماڵی جیۆلۆجی و بۆچوونی داروینیزمیش، قەوزەی ناو ئاو (طحلب) لە زیندەوەرانی ڕۆژگاری کۆنە و لە

---

[٨] ژمارە (٢)؛ ساڵی حەوتەم، ١٩٦٢؛ ل٧٣.

چینی یەکەمینی ژێر زەوی و سەرەتای دروستبونی گیاندارانە، بۆچی هەتا ئێستا هیچ جۆرە گەشەکردنێکی بەسەردا نەهات و ئەوەتا (سەراوی سوبحان ئاغا پڕیەتی لە قەوزە و کەس نییە پاکی بکاتەوە).

٥. دۆزینەوەی کەللەسەرێکی نێوان کەللەی مرۆڤ و مەیمون، یان دۆزینەوەی (بە بەردبوویەك) لە ناو دەنوکیدا ددانی هەبێ و بڕبڕەی ئێسکی هەبێ لەسەر کلکی، نابنە هۆی ئەڵقەی نێوان مرۆڤ و مەیمون، یان ئەڵقەی نێوان خشۆك و باڵندە، چونکە بە هەزاران جۆرە گیاندار و زیندەوەر بون و ماوەیەکی زۆر ڕووبەری زەوییان داپۆشیوە، بەڵکو زاڵبون بەسەر زۆربەی زۆری زیندەوەرەکانی تردا و کەچی ئێستا نێمە، ئێسکە ڕزیوەکانیمان دەستکەوتووە و خۆمان ناومان ناون، کێ دەڵی ئەو گیاندارانە جۆرە گیاندارێکی سەربەخۆ نەبون و لە ناو نەچوون، یان گیاندارێکی (ناوازە، شاز) بووە و جیاواز لە گیاندارەکانی تر و نابێتە یاسا، ئەگەر مردویەکی کۆنمان دەستکەوێت و بۆمان دەرکەوێت کە خاوەنی دوو دڵ بووە، ئایا ئەتوانین بڵێین کاتی خۆی مرۆڤ خاوەنی دوو دڵ بووە و گەشەی کردووە و دوو دڵەکەی بۆتە یەك دڵ، چونکە پێویستی پێی نەبووە و فڕێی داوە؟ نەخێر، بەڵکو ئەو مرۆڤە مرۆڤێکی نائاسایی بووە و ناکرێتە بنچینەی لێکۆڵینەوە بۆ مرۆڤەکانی تر و ڕاستی

فسـیۆلۆجی مـرۆڤ، یـان ئەگـەر پەیکـەری مرۆڤێکـی نێـر و مـێ (نێرەموك) کەوتە ژێر لێکۆڵینەوە، مانای ئەوە نابەخشێ کە مرۆڤ تێکڕا لە پێشدا نێرەموك بون و دوای گەشەکردنێکی داروینییانە لێك جیابونەتەوە و ژن و پیاو دروستبوو.

٦. ئـەوەش کـە داروینـی دەڵێـت: (هـەموو کـاتێ گەشـەکردن لـە بێهێزەوە بۆ بەهێز و لـە ناتـەواوەوە بۆ تـەواو هـەنگاوی ناوە) وا نییە، هەموو مێژوونوسەکان لەگەڵ جیاوازیی قوتابخانەکانیاندا لەسەر ئەو بۆچوونەن کە مرۆڤی سەدان ساڵ لەمەوبەر بەهێزتر و تەواوتر بووە لە مرۆڤی ئێستا[٩].

٧. بەهەشت گیان، لە ڕاستیدا تیۆری گەشەکردن هەر بەڵگەیەکی (زانسـتی!) ئەهێنێتـەوە بـۆ سـەلماندنی وتـەکانی، دەبێتـە قـوڕە ڕەشە و خۆی بە هەر چوار پەلەوە تێدەچەقێت، چونکە ئەگەر تیـۆری (گەشـەکردن) ڕاسـت بوایـە، ئەبوایـە ئێسـتا ئـەو گیانـدارە کۆنانـە نەمانایـەن و (وەکـو لـە پێشـەوە گوتمـان) هـەموویان گەشەیان بکردایە.

* بۆچـی ئـەمیبا هـەروا لـە کراسـی خۆیـدا مایـەوە و هـیچ هەنگاوێکی بەرەو پێش نەنا...؟

یان (شەنسەکەی سووتاوە)، ناوی لە تکتەکەدا دەرناچێت!!

---

[٩] عن الإنسان والمادية الداروينية، هادي المدرسي، دار التعارف، بيروت، ص٦٠.

* ئەی لە بیرت نایەت بەسەر پێرار کە لە پۆلی چواری ئامادەیی گشتی بویت، لە کتێبی (زیندەوەرزانی)یەکەتاندا (ل٢٦١ چاپی سێیەمی ١٩٧٥) خوێندتان، کە ڕووەکی (جنکۆ) لە ژێر ماڵەی سنەوبەرییەکانە و پێش (٢٣٠) ملیۆن ساڵ پەیدا بووە و تا ئێستاش لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی دوور هەر ماوە و هیچ گۆڕانێکیشی بەسەردا نەهاتووە، یان لە بیرت نایەت لە هەمان کتێب و لاپەڕەدا خوێندت کە ماسی (سلیکانپ)یش کە پێش (٣٠٠) ملیۆن ساڵ پەیدا بووە، تا ئێستا دەژی و هیچ گۆڕانێکی وای بەسەردا نەهاتووە کە شایەنی باس بێت، ئەی بۆچی ئەمانە گەشەیان نەکرد و هەروا مانەوە؟

* بۆچی کرمە سورەکەی زەوی گەشەی نەکرد؟

* ئەی بۆچی کێچ هەروا مایەوە؟ کە توێژەرانی زانکۆی (مۆناش)ی ئوسترالی بۆیان دەرکەوت (لە بەردەنی کێچێکی کۆنەوە) کە تەمەنی کێچ ئەگەڕێتەوە بۆ (١٢٠) ملیۆن ساڵ {ئەو بەردەنییەش لە توێی بەردەکانی (کۆنوارا) دۆزرایەوە}، هیچ پرشەیەکی گەشەکردن نەیگرتبووەوە.

* ئەی بۆچی کێچی ناوچاومارۆ هەر وا مایەوە[١٠]؟

---

[١٠] (الإنسان بين الخلق والتطور) محمد حسن آل ياسين، بەرگی دووەم، ل٥٥، چاپخانەی (المعارف) بەغداد، ١٩٨٠. وە کتێبی (نظرية داروين بين الفكر والقرآن)، محمد علي فلاحي، ل٢٠.

* بۆچـی ماسـی پرشـەی گەشـەکردن نەیگرتـەوە، لـەو ئاوە بێتـە دەرەوە و (سینەمایەك و سەیرانێکی سەر لوتکەکان)!؟ بۆچـی، بۆچی، بۆچی؟

بەهەشت: بە خوا کاکە تۆیش (توانج بازیت) بۆ وا؟

ئەورەسـی: بەڵگەیـەکی تـری داروینیـزم (وەك لـە پێشـەوە باسمـان کرد) لە زانستی (یەکالاکردن، نوێکردنەوە) بـوو، ئەوەبوو وتمان لـە کـاتی یەکالاکردنـەوەی هـەر زیندەوەرێکـدا زۆر نهێنیمـان بـۆ دەردەکـەوێت، وەك دەرکـەوتنی جێگـای چـوار پـەل لـە پەیکـەری ئێسکی مار و سەرنجدان لە پەنجەکانی مرۆڤ و مەیمون و مشك و مارمێلکە...هتد.

شێوەی سوڕانی خوێن چوونیەك لـە مـەیمون و مـرۆڤ و.. هتـد، ماوەی سکپڕبون و مانـەوەی ساوا لـە سکی دایکیدا و ماوەی شیرخواردن... گـەلێ شـتی تـر لـەم بابەتـە، کـە مـرۆڤ هاوبـەش و هاوێنەیی دەکات لەگەڵ زیندەوەرەکانی تر و عەزمی داروینیـزم جەزم دەکات کە بڵێ: ئەم ئیاندارانە لە یەك هۆز و بەرەبابن.

بەهەشت: ئەی تۆ بۆچوونت چۆنە؟

ئەورەسی: بۆچوونی من، بەهەشت گیان، ئەوەیە:

١. ئـەم شـێوە لێکچـوونەی مـرۆڤ لەگـەڵ ئـەو زیندەوەرانـەدا بـەو شێوەیە و بەو پڕێستییە نییە، داروینی دەمی لێهەڵماڵیوە، وەك ئەم هاوێنەییە هەیە لە نێوان مرۆڤ و هەر زیندەوەرێکدا، بەلام

زۆر جیاوازیی گەلێ لەوانە گرنگتر هەیە دەبێتە هۆی دورخستنەوەی مرۆڤ لە زیندەوەرەکانی تر، بەلاّم داروینی جلەشڕەی بەسەردا دەدات.

خۆ ئەگەر نزیکترین مەیمون لە مرۆڤەوە کە (شەمپازی، یان گۆریلا)یە بهێنین و بەرابەرییەکی وردی لەگەڵ هەر مرۆڤێکدا بکەین، سەیر دەکەین:

* ددانی مرۆڤ کەڵبەی درێژی نییە، بەڵکو ددانەکانی هەموو خشتن و شێوە بازینەیی هەڵکەوتووە، بەلاّم ددانی مەیمون لە پێشەوە تەسك و لە دواوە هەردولا کاجیرەی درێژ بونەتەوە، بە شێوەی پیتی (U)ی ئینگلیزی و نێوان هەردوو ددانی ئەملاولا تەسکن و وەك ددانی مرۆڤ بلاّو نین[11].

* کەللەسەری مرۆڤ لەسەر چەقی بڕبڕەی پشت ڕاوەستاوە، کەمێك بۆ پێشەوە بۆ ئەوەی هاوسەنگیی سەر وەربگرێت و خوار نەبێتەوە، (وەك سەری مەیمون) بە ڕێکی بوەستێت.

* بڕبڕەی پشتی مرۆڤ شێوە کەوانەییەکی تێدا بە دی دەکرێت، بە شێوەی پیتی (S) بۆ ئەوەی هەموو سەنگایی لاشە ڕێك بگاتە سەر لاقەکان، (بە پێچەوانەی مەیمونەوە).

---

[11] (الطريق الطجول الى الإنسان) رووبرت. ل. ليرمان، گۆڕینی بۆ عەرەبی د. ثابت جەرجيس قسبضي، المؤسسة الوطنية للطباعة والنشر، لبنان، ص١٧٧.

ـ لەبـەر ئـەوەی مـرۆڤ { لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ } (الـتين : ٤ )[١٢] دروستکراوە و لەسـەر دوو پـێ دەڕوات (قنج و قیـت)؛ بـە پێـوە دەوەستێ، کە ئـەویش یارمـەتیی دەدات لـە زۆر کاروباریـدا، وەك خەلیفەیـەکی خـوا لەسـەر ئـەم زەوییـەدا. ئـەبینین دەسـتی مـرۆڤ کورتە و ناگاتە زەوی، بە پێچەوانەی مەیمونـەوە کـە دەستەکانی درێژە و هاوکێشی لەگەڵ لاقەکانی دەکەن.

* لەمانە هەموویان گرنگتر و هۆی جیابونـەوەی مرۆڤ لـە هـەموو گیانـدارێك بریتییـە لـە مێشـك و کەللەسـەر، فراوانـی مێشـك و مۆخـدانی نـزیکترین و پێشـکەوتووترین مـەیمون هـەرگیز لـە (٦٠٠)سم[٣] زیـاتر نییـە، کەچـی ناوەنـدی فـراوانترینی مێشـك و مۆخـدانی مرۆڤـە کـە بریتییەلـە (١٣٥٠ هـەتا ١٥٠٠)سـم[٣]، کـە مۆخدانی کەللەسەری مرۆڤ هەردوو نیوەی کەللەکەی داپۆشیوە و پـڕی کردووەتـەوە، ئەمـەش تـاجێکی خواییـە بـۆ سـەری ئـادەمیزاد و بریتییـە لـە ئەرشـیفی زانسـت و زانسـتی، خـۆ لـە ڕووی دەرەوەی کەللەسەر ئەو قەراغ و لێوارانەی کەللەی مەیمون هەیەتی مرۆڤ نییەتی.

*ماسـولکەی شـەویلگە و چـەناکەی مـەیمون بـەهێزترن لـە ماسولکەی شەویلگەکانی مرۆڤ، چونکە مرۆڤ (نەجیب خۆرە).

---

[١٢] خوا دەفەرموێ: ئێمە مرۆڤمان لە جوانترین قەد و بالآ و فۆڕم دروستکردووە.

*خۆ ئەگەر لە مانای ڕاستەقینەی ئایەتی { وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا } ( البقرة : ٣١ )

بگەین، زانستی و ژیریی هەرگیز ڕێگەمان نادەن بیر لە بەراوردکردنی مرۆڤ لەگەڵ هیچ گیاندارێکی تردا بکەینەوە.

ئەو زانستیانەی خەڵاتی خوایە بۆ مرۆڤ، ئەو هەڵسوکەوت و کاری ڕۆژانەی مرۆڤ هەر لە بەیانی و کاتی لە خەو هەستانی هەتا ئێوارە و چوونە ناو جێگا، جلوبەرگ، داهێنراو و دروستکراوەکانی مرۆڤ، ئۆتۆمبیل، فڕۆکە، ڕۆکێت، ڕۆشنبیری و ڕەوانبێژی، تام و مەزەی ئەدەبی.

ئایین پەروەریی و خواناسیی (کە تاجی سەری هەموویانە)، خۆشەویستی، دروستکردنی پارتە ڕامیارییەکان و نەخشەی کۆمەڵ و تاک، قوتابخانە و زانکۆ، یاری و ڕابواردن، ئەم دروستکراوە ئەفسانەییەی ناوی مرۆڤە، کاتێ بەو کردەوە و ڕێکخستنی ژیانەی هەڵئەستێ بە هیچ گەز و پێوانەیەکی هەڵسەنگاندن لەگەڵ گیاندار و زیندەوەرەکانی تردا دەرناچێت، مەسەلەکە زۆر قوڵترە لە قەوارەی کەللەسەر، یان خڕی و لاکێشەیی ددان!!

٢. بەهەشـــت گیـــان، هـــەرگیز لێکچـــوون و هاوبەشـــیکردن و هاوچەشـــنی دوو شـــت، مانـــای گەشـــەکردنیان لـــە یـــەکتری نابەخشێ.

بۆ نمونە: ئەگەر لە یەك ڕیزدا (گالیسکەی دەستی و گالیسکەی (عەرەبانـە)ی یـەك ئەسپی و گالیسکەی دوو ئەسپی و هـەر لـە ڕیـزی ئەمانـەوە لـە یەکـەمین مـۆدێلی ئۆتۆمبیـل تـا دوا مۆدێـل، شەمەندەفەریش هـەر بـەو جۆرە، دوای ئەمانیش هـەر لە یەکـەم فڕۆکەوە تا دوا داهێنراوی هێـزی ئاسمانی و ڕۆکێت و کەشتی بـن دەریـا، ئەمانـە نموونـەی هەریەکـەیان لـە یـەك ڕیـزدا، ڕیـز بکرێـت، دروسـتکەر و داهێنراوەکانیـان لێبقرتێنـرێن و بـەبێ دروستکەر سەیریان بکەین و ژیریی و زانایی و توانایی دەستە کارگەرەکە لە لیستە بسڕینەوە، واتە: بڵێین خۆیـان لـە خۆیانەوە بەبێ وەستا دروستبون. ئێمەش ئەو کاتە بۆمـان هەیـە بڵێین ئەم شتانە (هەر لە یەکەمین گالیسکەوە هـەتا دوا ڕۆکێت) بە ڕێگای گەشەکردن خۆیان هەر لە خۆیانـەوە بەپێی باری و پێویستی و خۆســازدانیان لەگــەڵ دەوروبەرەکــەیان و بــەپێی هانــدەرێکی ناوخۆیی گەشەیان کردووە.

خــۆ ئەگــەر ئــەم دروســتکراوانە بخەینــە ژێــر نەشــتەرگەریی یەکالاکردنەوە و توێکردنەوە، ئەویش دەڵی ڕاستە، چونکە ئەم شــتانە هــەموویان لــە دار و ئاســن و چــەرم دروســتکراون و

هەموویان لە بۆدی و چەند تایەیەك پێکهاتوون، هەندێکیان بە پاڵ و هەندێکیان بە بەنزین و هەندێکیان بە گاز و هەندێکیان بە ڕۆن کاردەکەن، مەکینەی زۆربەیان لە (سلندەر و پوستن) پێکهاتوون، هەزاران شتی تر لەیەکچوون و یەك پارچەی هاوبەش، ... هتد

ئێمەش کاتێ چاوی خۆمان لە ئاستی وەستاکانیان (ژیری مرۆڤ) بنوقێنین، بۆمان هەیە بڵێین ئەمانیش لە ئەنجامی زۆرانبازیی ناو خۆیان و هاندەر و پاڵەپەستۆیی ناوخۆیی گەشەیان کرد و تا دوا لوتکەی گەشەکردن (قمة التطور)ەکەی شلێمۆ مۆشی)[١٣] ئەو ڕۆکێتەی ئەمڕۆ بەدی دەکرێت، ڕۆژێ لە ڕۆژان گالیسکە بووە!!.

بەڵام لە ڕاستیدا ئەو شتانە هیچیان لە خۆیانەوە، یان بە پاڵەپەستۆی ناوخۆیی گەشەیان نەکردووە، بەڵکو ئەم لەیەکچوونە و یەك کەرەستەییە بەڵگەیە بۆ ئەوەی ئەمانە بەرهەمی یەك ژیریی و یەك نەخشەن، کە ئەویش ژیریی و نەخشەی مرۆڤە.

٣. بەهەشت گیان، بۆچی پرسیار لە داروینیزمەکان ناکەن و بۆچی هەر باسی لێکچوونی مرۆڤ و زیندەوەرەکانی تر ئەکەن،

---

[١٣] الإنسان قمة التطور، سلامة موسى.

کەچی هەرگیز باسی ئەو هەموو جیاوازییە گەورانەی نێوان مرۆڤ و گیاندارەکان ناکەن؟

**بەهەشت:** داروینی هەژار هیچ بەڵگەی تری ماوە هەتا تۆش چەکوشکاریی بکەی؟

**نەورەسی:** بەڵێ، بەهەشت گیان، بەڵگەیەکی تری داروینی ئەوەیە دەڵێ: (هەندێك جار منداڵێك دەبێ پارچەیەکی زیندووی نائاسایی لێبەدی دەکەین، وەك ئەوەی منداڵێك لە دایك دەبێ، سەیر دەکەین لە جێگای کۆنە کلکیدا کلکێکی لێڕواوە، یان ساوایەك لە دایك دەبێ و بە تیسکێکی نەرمی ئاژەڵی لاشەی داپۆشراوە، داروینیزم دەڵی: ئەمانە بەڵگەن بۆ ئەوەی کە ئەم ساوایە گەڕاوەتەوە بۆ بنچینە و بناغەکەی خۆی کە ئاژەڵییە!، ئەم دۆخ و ڕوداوانە ناو ئەنێت بە (هەڵگەڕانەوە لە دۆخی مرۆڤی بۆ دۆخی ئاژەڵی - الردة)، یان لەدەستدەرچوونی سروشتی - فلتات الطبیعة).

**بەهەشت:** ئەی تۆ بۆچوونت چییە؟

**نەورەسی:** بە ڕاستی بەهەشت قسەی خۆمان بێ، با کەس گوێی لێنەبێ، ئەمە (فلەی تەبیعەتە)چونکە:

١. نە (فلە) و نە (ردە) نییە، بەڵکو ئەم جۆرە دیاردانە تەنها نەخۆشین و هیچی تر، ئێستا زانستی پزیشکی تازە زۆر بە وردی هۆکانی ئەزانێ و لە ڕێگای نەشتەرگەرییەوە ئەیقرتێنێ.

٢. نەتبیستووە، زۆرجار ـ زیاتر لەو دیاردەی پێشووە ـ منالێك پەیدا دەبێ و کۆئەندامی زاوزێی نێرینە و مێیینەی هەیە و پێی دەڵێن (نێرەموك) ئایا ڕاستە بڵێین لە پێشدا هەموو مرۆڤێك کۆئەندامی نێر و مێی بووە و ژن و پیاو بووە!؟ بۆیە ئەم ساوایە بەو شێوەیە لە دایکبووە، چونکە گەڕاوەتەوە بۆ بنچینەی خۆی؟

٣. ئەگەر گەڕانەوە (ردە) ڕاست بوایە، ئەبوایە جارێك ئافرەتێك بەچکە (شەمپازی، یان گۆریلا، یا تووتەڵە سەگێکی) ببوایە.

٤. لە ساڵی (١٩٧٨)دا ڕۆژنامەی (الجمهوریە)ی عێراقی لە دوا لاپەڕەیدا وێنەی کابرایەکی خەڵکی (حللە)ی بڵاوکردەوە کە هەر بە منداڵی و لە کاتی لەدایکبونیدا شاخێك لەسەر سەری ڕوواوە و ئەو ساڵەی (١٩٧٨) لە نەخۆشخانەی (کۆماری) ئەو شارە بۆیان نەشتەرگەری کرد و بۆیان دەرهێنا و بە ئەندازەی شاخی (مانگا)یەك دەبوو.

ئایاڕاستە بڵێین ئەم دیاردەیە ئەوە دەگەیەنێ کە بناغەی مرۆڤ، گا، یان گامێش، بووە و ئەم پیاوە گەڕاوەتەوە بۆ بنچینەکەی خۆی؟ بێگومان نەخێر.

## یاساکانی داروینی:

بەهەشـت: کاکەگیان ئەی یاساکانی داروینیـزم لە بارەی تیـۆری پەیـدابون و گەشـەکردنەوە چـییە و چـین؟ بـەڵام تـۆ بەڵگـەی زانسـتییەکانیانت(!) بـەو شـێوەیە دا لـە بێـژنگ و شـڕ و وڕت کردن، دەبێ یاساکان چی لێ بکەیت؟

نەورەسی: ئەو ڕەخنانەی کە لە بەڵگەکانی گیرا و باسمان کرد، هەموویان ڕاستییەکی دیار و زەقن، ئێمەش نامانەوێ کوێرانە هەرچـیمان لـە ئـەوروپاوە بـۆ بێـت بـە پـیرۆز سـەیری بکـەین و نـەوێرین دەستی ڕەخنـەی بۆ درێـژ بکـەین، نـا، نابێ، بەهەشت گیـان، یاسـاکانی داروینیـزم هـەروەك لـە پێشـەوە نـاوی هـەر چواریانمان هێنا، بریتین لە:

١. زۆرانبازی بۆ مانەوە.

٢. یاسای هەڵبژاردنی سروشتی.

٣. یاسای خۆسازدان لەگەڵ دەوروبەردا.

٤. یاسای بۆماوە و بازدان.

جا ئێستا با یەکە یەکە و هـەر یاسایەك بە جیا باس بکـەین بـە پشتیوانی خوای گەورە.

بەهەشت: باشە فەرموو.

ئەورەسی: یاسای یەکەمی داروینی (زۆرانبازی زیندەوەران بۆ مانەوە) داروینی دەڵی: "زۆرانبازییەکی سەرەمڕ لە نێوان زیندەوەرەکاندا هەیە لەسەر پێداویستییەکانی ژیان"[14].

جا ئەو زیندەوەر و گیاندارەی بەهێز و بازووە، وا ڕۆژ بە ڕۆژ گەشە دەکات و ئەمێنێتەوە، ئەوەیش کە لاوازە بەرەو نەمان ئەڕوات، هەتا قەرەچۆڵی ئەبڕێت و نامێنێ، واتە: پایەیەکی مانەوە و گەشەکردنی گیانداران (زۆرانبازییە) زۆرانبازی بۆ مانەوەی گیاندارە بەهێزەکان لە پاش قڕکردنی گیاندارە لاوازەکان.

بۆ نمونە: ئەگەر گاگەلێك لە بێشەیەکدا بژین و دوایی وردە وردە زۆر بن و لەسەر لەوەڕ تەنگ بە یەکتری هەڵبچنن، ئا لەم کاتەدا ئەو وڵاخەی بەهێزە ڕووبەرێکی فراوانی پڕ لەوەڕ بۆ خۆی دابین دەکات و هەتا بڕوات قەڵەوتر و بەهێزتر دەبێ و ئەو وڵاخەی لاوازە لە ترسی قۆچی وڵاخە بەهێزەکان بە وشکی هەر کاوێژ دەکات و هەتا بڕوات بەرەو لاوازیی زیاتر ئەڕوات، تا لە ئەنجامدا بە لادا دێت و مردار دەبێتەوە و نامێنێ[15]، هەروەها لە

[14] نامیلکەی (داروینی) نوسینی ئەندریە کرسۆن، کردنە عەرەبیی (سەلما زیادة، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، ص٣٢-٣٣.

[15] (أصل الأنواع داروین)، ص٢٢٧، نمونەی گورگ و ئاسکەکان.

هەموو جیهانی گیانداراندا مانەوە بۆ دەسەلاتدارە و نەمان بۆ بێدەسەلات، ئەمەبوو بە کورتی یاسای داروینیزم لە بارەی (زۆرانبازی بۆ ژیان).

**بەهەشت:** ئەی تۆ دەڵیی چی؟

**نەورەسی:** منیش دەڵێم:

١. ڕاستە زۆرانبازیی و بگرە و بەردەی خوێناوی لە نێوان گیاندارەکاندا هەیە، هەر یەکەیان دەستی ڕۆشت ئەوی تر دەکاتە نێچر، بەلام ئەمە نابێتە هۆی تێکدانی هاوکێشی ژیان لە نێوان گیاندارەکاندا، کاتیٚ کارەساتێکی خواکرد، یان وەك ئەوان دەڵێن کارەساتێکی سروشتی ڕووئەدات، وەك لافاو، بومەلەرزەیەك، ...هتد، گیانداری بەهێز و بێهێز وەك یەك درەو دەکات، یان کاتیٚ ئەو گۆماوەی کۆمەڵە گیاندارێکی لەسەر ئەژی و وشك دەکات و بیابانێکی کاکی بە کاکی دەکاتە گۆڕیان، چ جیاوازییەکی مردنی گیانداری بێهێز و هێزدار هەیە!!؟[١٦]

کە ئەمەش لاسەنگی تەرازووی لاوازیی و هێزداری گیاندارەکان هاوکێش دەکات.

٢. ئەم یاسایە یاسایەکی زانستیی ورد نییە، چونکە بە پێی ڕیزکردنی داروین (شێر) لە گیاندارە دڕندە بەهێزەکانە و

---

[١٦] (عن الإنسان والمادية الداروينية)، هادي المدرسي، ص٢٧، دار التعارف بيروت، ١٩٧٨.

(میکرۆب) لە گیاندارەکانی چینی خوارەوەی بێهێزە، کەچی زۆر جار ئەبینین میکرۆب شێر و لە شێریش بەهێزتر دەکاتە خۆراك و لە ناوی دەبات[17].

٣. ئەگەر سەیری ناو بێشەڵانەکان و دەریاکان بکەین، ئەبینین گیانداری دڕندە و بەهێز لە تەنیشت گیانداری بێهێزەوە ئەژی و لـە کـۆنترین ڕۆژگـاری مێـژووەوە تـا ئـەمڕۆ، ئەگـەر یاسـا (زانسـتییەکەی داروێـن) ڕاسـت بوایـە، دەبوایـە ئێسـتا دەمێـك بووایـە گیانـداری لاواز و کـەم هێـز لـە سـەر زەویـدا نەمایـە و چـینێکی جیۆلـۆجی زەوی لـە ترسـی گیانـداری هێـزدار بیشاردنایەتەوە[18].

٤. ئەم ژیانـە بـەو شێوەیە بێ خاوەن نییـە، وەك مادییـەکان و داروینیزم بیری لێدەکەنەوە، بەڵکو خاوەنێکی هەیە و هاوکێش و هاوسەنگ و سنور دائەنێ بۆ هەموو گیاندارێك، ئەوەی بە لای داروینیزمـەوە زۆر بـەهێزە، لای (خـوا) زۆر بێنرخـە و زۆر بـە ئاسانی قەمتەری دەکات.

ئەگـەر بـە تـەرازووی مادییـەت ژیـلان بکێشـین زۆر لاسـەنگ دەردەچێت، با سەرنجی (بۆق)ێك بدەین سەری دەکەین زیاتر لە

---

[17] نظرية داروين بين الفكر والمطلق والقرآن الكريم، محمد علي الفلاحي، ص١١.

[18] كبرى اليقينات الكونية، د. محمد سعيد رمضان البوطي، ص٢٨١.

هەزار هێلکە (گەرا) دائەنێت، بەڵام ژمارەیەکی زۆر کەم لەو گیانداره هەڵدێت، ئەم هەڵهێنان و بەخشینی ژیانە بەو (سەرەمێکوت)انە، هیچ پەیوەندیی بە بەهێز و بێهێزەوە نییە، لەبەرئەوە نەبووە کە ئەو گەرایە کلکی هەبوو، ئەوی تر کلکی نەبوو، یان خۆی بۆیاخ کرد بۆ ئەوەی نەناسرێ و مردن نەیدۆزێتەوە و ئەویتر بۆیاخی دەست نەکەوت[19].

٥. ئای بەهەشت گیان، چەند پیاوی ترسنۆك و بێنرخ پیاوانی ئازا و جەرگبڕ و شێر خۆریان زۆر بە ئاسانی و بە فرت و فێڵ و ساختە لەناوبرد، ئەمە لە کوێ و یاسای (البقاء للاصلح)ەکەی داروینەفەندی لە کوێ ؟

٦. بەهەشت گیان، ئاشکرایە ئێوەی ئافرەتان خوا لەش و لارێکی ناسك و نازداری پێبەخشیون، ئێوە کەمتر لە پیاوان بە تێکڕایی بەرگەی سەرما و سۆڵە و کۆسپەکانی ژیان دەگرن، چونکە پیاوی دڵڕەق و لەش پۆڵایین زیاتر بەرگە ئەگرێت، کەچی لە سەرانسەری مێژوودا ژمارەی ئافرەت (بە دەگمەن نەبێ) زیاترە لە ژمارەی پیاوان و هەر پیاوانە ئەبنە خۆراکی ئاگری هەموو شۆڕشی و جەنگەکان[20].

---

[19] :عن الإنسان والمادية الداروينية، هادي المدرسي، ص٢٨١.

[20] الداروينية، عرض وتحليل، يحيى محمد، دار التعارف، لبنان، ١٩٧٩، ص٥١.

**هەڵبژاردنی سروشتی:**

**بەهەشت:** ئەی مەبەستی داروینی و داروینیزم لە هەڵبژاردنی سروشتی چییە ؟

گوایە سروشت (هەللور بللور) دەکات بۆ گیاندارەکان ؟

**نەورەسی:** بەهەشت گیان، داروینیزم دەڵی، ژیان کە بریتی بێ لە زۆرانبازیی و شیشانە یەکتری و دەرچوونی ئەوانەی شیاوترن بۆ مانەوە لەم کاتی جەنگە خوێناوییەی گیانداران و دوژمنانی دەوروبەریدا (وەك نەخۆشی و نەمانی خواردەمەنی و نەمانی ئاو و پەیدابونی لافاو...هتد)

سروشتی هەندێ گیاندار بەهێز دەکات بۆ بەرگەگرتنی ئەو لیقەومان و دەربازبونی لەو تاقیکردنەوەدا، بۆ نموونە: ئەگەر لافاوێکی سامناك ڕووی کردە بێشەیەك و بێشەکەی داپۆشی، ئەو گیاندارەی بەهێز و بەتوانایە دەرباز دەبێ و ئەوی لاوازبێ لافاوەکە دایئەماڵێ و لاشەکەی لە بن کەندرەکان بە سارد و سڕی بەجێ دەهێڵێ.

**بەهەشت:** بۆچی داروین لای وایە (سروشت) ژیری بەخشین و هەڵبژاردنی هەیە ؟ واتە وەك ئێمەی مرۆڤ خاوەنی ژیریی و نەخشەیە ؟

**نەورەسی:** بەڵێ، بەهەشت گیان، داروین لای وایە سروشت خاوەنی ژیریی و توانا و هۆشە، گەلێ زیاتر لە مرۆڤ!!

بـەڵکو مـرۆڤ خۆپەرسـتە، بـەڵام سروشـت ڕۆڵـەکانی ئـەپارێزێ، فەرموو ئەوە کتێبی (أصل الأنواع) کە داروین خۆی دایناوە و بە پیرۆزتـرین کتـێبی داروینیـزم دائـەنرێت و (اسماعیـل مظهـر) وەرگێـڕاوە بـۆ عـەرەبی و لـە بڵاوکراوەکـانی کتێبخانـەی (النهضـة)ی بەغدادیـە و سـاڵی (١٩٧٢) چـاپکراوە، (داروین) خۆی دەڵی: "وا دەردەکەوێ مرۆڤ ئەوەی کە قازانجی خۆی تێدا نەبێ، هـەڵی نابژێری، بەڵام سروشت هیچ هۆیـەکی هەڵبـژاردنی ناوێت و بەکاری ناهێنێ ئەگەر سوود و مانـەوە و پارێزگاریی زیندەوەرەکانی تێدا نەبێ، سروشت هەرچی سیفەت و ڕەوشت و خاسێتی چاکە هەبێ لە زیندەوەرەکاندا هەڵیئەبژێرێ، هەرچی ئەوێ نایەوێ"[21].

**بەهەشت:** ئەی تۆ دەڵیی چی؟

**نەورەسی:** من دەڵێم:

١. مـردن کێشـەیەکی چارەنووسـی و خـواکردە، هـیچ پەیوەندییەکی بە لاواز و بێهێز، یان زۆردار و تواناوە نییە، ئەو گیانداره‌ی ئەمڕۆ بەهێزە سبەینێ پیر و نەخۆشە و بێهێزە، بە ڕاستی بەهەشت گیان ئەم بەڵگەی داروینییە زۆر سەرزارەکییە و دوورە لـە وردەکـاریی و وردبینیـی زانسـتییەوە، ئـەو گیانـدارە

---

[21] (تطـور الجـنس البشـري)، د. محمـد السـد غـلال، مكتبـة الأنجلـو المصـرية، ١٩٧٤، چاپی پێنجەم، ص٣٩.

بەهێزەی ئەمڕۆ بەهێزە، داروین وائەزانێ سروشت هەڵیئەبژێرێ لاوازەکان ئەکوژێ، ئەوە هێشتا سەرەی مردنی نەهاتووە، ئەگینا چەند ڕۆژگارێك لە پێش ئەمدا ئەم پیر و لاوازە وەك ئەو بەهێز بوو، بە توانا بوو، کاتێ کە لافاوەکە دای لە دارستانەکە و پیرەکانی پێچایەوە و گەنجەکان دەربازبون، مانای ئەوە نییە جۆرێکی تازەی گیاندار دروست ئەکەن[٢٢].

٢. ئەگەر خەیاڵ پلاوەکەی داروین ڕاستە و سروشت هەرچی شیاوترە بۆ مانەوە، هەڵیئەبژێرێ، گەندەڵەکان لە ناو دەبات، بۆچی تا ئێستا هەر لە یەکەم زیندەوەرەوە (یەك خانە - وحيدة الخلية) هەتا سەر مرۆڤ، هەر ماون و بۆچی سروشت گوڵبژاردەی نەکردن و هەڵیان نابژێرێ!!؟

یان ئەگەر کاری سروشت هەڵبژاردنی چاکترە، بۆچی هەتا دێت چاك وەك خۆی ئەمێنێتەوە و بەدیش وەك خۆی ئەمێنێتەوە!!؟ بۆ ئەگەر سەیری چینەکانی توێی زەوی بکەین پەیکەری ئێسکی گیاندار و زیندەوەرێکی تر بەرچاو دەکەوێت کە زۆر قەبە و بەهێز و بە توانا بون و بەرگەگری تاڵی و سوێریی ژیان بون، وەك (دەیناسوڕ) کەچی قڕبون و بنەبڕ بون، ئێستاش ئەبینین

---

[٢٢] (عن الإنسان والمادية الداروينية)، هادي المدرسي، ص٣٠.

گیانـداری لاوازی وەك ئاسـك و پشـیلە یـان سـەگ و...هتـد، ماونەتەوە!!؟؟

٣. ئـەم هەڵبـژاردنی سروشـتییەی داروینیـزم کردویەتیـە بەڵگەیـەکی زانسـتی (!) و زۆر پشتەسـوورێتی، وا نییـە، ئەگـەر سروشـت چـاکتر و شـیاوتر هەڵئەبژێرێت، بۆچـی لـە بنەماڵـەی (کـەر) (ئەسـپ و مـایین) هەڵئەبـژێرێ ؟؟ لەگـەڵ ئەوەشـدا کـەر شیاوترە بۆ مانەوە هەتا ئەسپ و مایین، یان بۆچی لە خێزان و نەتەوەی (کەڵەکێوی) گیاندارێکی وەك (ئاسك) هەڵئەبژێرێ، بەو ناسکی و کەم هێزییە؟ ئایا ئەمە پێی دەڵێن هەڵبژاردنی چاکتر بۆ مانەوە، یان هەڵبژاردنی جوانتر بۆ مانەوە؟؟

٤. داروینیزم دەڵێ: پەپوولەی باڵ نەخشین و ناسك و بێوەی و خۆشەویست کوڕەزای زەردەواڵەی بە ئازار و جەربەزە و هار و هاجە، ئایا ئەمە (الانتخاب الأصلح)ە؟ یان کۆتری باڵ نەخشین و تاوسـی ڕەنگـاوڕەنگ و چـۆڵەکەی ئێسـك سـووك، نەتـەوە و لـە هۆزی داڵ و داڵەکەر خۆرەن!!؟ ئایا ڕاستە ئەم هەڵبژاردنە!!؟[٢٣].

بەهەست گیان، ئەمانە هـەموویان یاسای (هەڵبـژاردنی چاکتر بۆ مانەوە بە درۆ ئەخەنەوە، چونکە باڵی ڕەنگاوڕەنگ هیچ لە هێزی

---

[٢٣] (القـرآن محاولـة لفهـم عصـري) د.مصـطفى محمـود، دار الشـروق القـاهرة، ١٩٧٣، چاپی سێیەم، ص٤٦-٤٧.

فڕین زیاد ناکات و هەڵبژاردنی سروشتی نرخدار ناکات، بەڵکو دەستی هونەری تاقە دروستکەر (خوا)مان نیشان ئەدات.

٥. ئەگەر هەڵبژاردنی سروشتی بریتییە لە هەڵبژاردنی سیفەتی چاکەی گیانداران و پاڵپێوەنانی زیندەوەرەکان بەرەو چاکتر، بۆچی لە نەتەوە و هۆزی (کەر) گیاندارێکی نەزۆك و بێنەوەی وەك (هێستر. ئێستر) ئەخاتەوە؟ ئایا ئەمە هەڵبژاردنی چاکترە!؟

٦. خۆ ئەگەر سەیرێکی مرۆڤ (لە ڕوانگەی داروینەوە) بکەین و چاوی خۆمان لە هەموو ڕاستییەکی زانستی بنوقێنین و باوەڕ بە گەشەکردنی بهێنین، با سەیر بکەین و بەراوردی نێوان مرۆڤەکانی ئەوسا و مرۆڤەکانی ئێستا بکەین، بزانین کامیان بەهێزتر بون و کامیان بە تواناتر بون، مرۆڤەکانی (نیاندەرتاڵ و جاوە) یان مرۆڤانی سەدەکانی ناوەڕاست و ئێستا؟

٧. با داروینیزمەکان پێمان بڵێن: چ هەڵبژاردنێکی تێدایە لەوەی جوانی و نەرم و نۆڵی و ناسکی داوە بە ئافرەت و بەشی پیاوی نەداوە (لە مرۆڤدا) کەچی لە هەندێ گیانداری تردا جوانی بەخشیوە بە نێرینەکان و بەشی مێیینەکانی نەداوە، وەك کەڵەشێر و مریشك و تاوس و....هتد

هەندێ گیاندار نێر و مێی وەك یەکن لە جوانیدا، وەك کۆتر و قاز و لەقلەق و... هتد

ئایا ئەمە پێچەوانەی هەموو هەڵبژاردنێکی سروشتی نییە؟[24].

٨. ئەو گێژ و خولەی بەسەر گیاندارەکاندا دێت و بەرزبونەوەی هەندێك و لەناوچوونی هەندێك زۆر قوڵترە لە یاسای هەڵبژاردنە سروشتییەکەی داروین، چونکە نە داروین خۆی و نە داروینیزمی ئێستا، خۆیان لە وشەی سروشت نەگەیشتوون، جارێك هەرچی سیفەت و دەسەلات و توانای خوایەتی هەیە ئەیدەنێ و ئەیکەنە (واحد القهار) و جارێکی تر داماوی ئەکەن لە ژێر چەپۆکی ئادەمیزاددا، کاتێ بیانەوێ باسی پێشکەوتنی مرۆڤ بکەن دەڵێن: (مرۆڤ بەسەر سروشتدا زاڵ بوو)[25]، خوای دوێنێ و بەندەی مرۆڤی ئەمڕۆ.

٩. سروشت بەپێی گەز و تەرازووی ماددیەتیش بێ، کار لە شت دەکات، کار لە (موجود) دەکات ئەی ئەگەر نەبوو کار لە چی دەکات ؟ واتە: ئەگەر گیاندارێك چاوی هەبوو، سروشت کاری لێدەکات بەوەی کوێری بکات، ئەی ئەتوانێ (سروشت) چاو ببەخشێ بە گیانداران؟ برگسۆن دەڵی: "چۆن ژێری گاڵتەمان پێناکات بڵێین (سروشتی کوێر) چاوی بەخشیوە بە زیندەوەران، ستەمێکی زانستییە ئەگەر بڵێین چاوی گیانداران یەکسەر لە

---

[24] (الداروينية، عرض وتحليل، يحيى محمد، ص٥٣.

[25] (الإنسان والداروينيية)، محمد صالح كريم خان، چاپی یەکەم، چاپخانەی (الجمهورية) موصل، ١٩٧٦، ص١٢٣.

ماددەوە دروستبووە، خۆ ئەگەر خۆشمان بخەینە گێژاوی تیۆری گەشەکردن و بڵێین چاو هێزی بینین لە هەموو گیاندارەکاندا لە پاش هەزاران گەشەکردن و زنجیرە دۆخ و کارتێکردنی دەوروبەروبەر گەیشتۆتە ئەم قۆناغەی ئێستا، ئەویش بە هۆی هەڵبژاردنی سروشتییەوە، ئەی ئەتوانین قەناعەت بە ژیریمان بکەین کە هەموو گیانداران بە یەك دۆخ و دەوروبەردا تێپەڕبون؟ چۆن ئەتوانین بڵێین هەموو گیانداران لە یەك دۆخدا ژیاون؟ خۆ ئەگەر وتمان گیانداران لە دۆخی جیاجیا و شوێنی جیاجیا و دەوروبەری جیاوازی نێوان ورچەکانی ناوچە تەوەرییەکان و ورچەکانی ناوچەی کەمەرەی زەوی ئەبوایە چۆن دەوروبەر کاری کردۆتە سەر پارچەکانی تری لەشیان، هەر وا کاریشی بکردایەتە سەر چاویان، کەچی سەیر دەکەین چاو و کۆئەندامەکانی دیتن لە هەموو گیاندارەکان (ئەوانەی کە چاویان هەیە) وەك یەکن و نەگۆڕاون، بۆیە دەستەوسانی و دەستەئەژنۆیی داروین بە ئاشکرا ئەبینرێت و خۆی پڕ بە دەمی خۆی هاوار دەکات، لە نامەیەکی داروینداا کە بۆ هاوڕێیەکی نووسیوە، دەڵی: "هەرچی

بیر لـە چاو و چۆنێتی دروستبونی چاو ئەکەمەوە، لەرزوتا دام ئەگرێت و نەخۆش ئەکەوم"[26].

١٠. بۆ شیتەڵکردنەوەی وشەی (سروشت) و توانینی هەڵبژاردن و تـوانینی دروسـتکردن، ئەڵقـەی دووەمـی ئـەم زنجـیرەی (تەرازووی ژیری)یە و کتێبی (سروشت لە تەرازووی ژیریدا) ئەم وشەیەی بۆ کێشاین و نامانەوێ دیسان دوپاتی بکەینەوە.

١١. کـاتێ دەڵـیین (هەڵبـژاردنی سروشـتی) دەبـێ بـزانین ئایـا سروشت خۆی ژیریی هەڵبژاردن و جیاکردنەوەی باش لە خراپ و بەرز لە پەستی هەیە؟ ئایا ئەتوانرێ شت هەڵبژێرێ؟ ئەو کاتە ئەتوانین بڵێین (هەڵبـژاردنی هەیـە)، ئاشکراشـە سروشـت تـەنها ماددەی کـەڕ و کـوێر و بێژیرییـە و ئـیتر چـۆن ئـەتوانێ شـت هەڵبژێرێ و (هەڵبژاردنی سروشتی چی)؟[27].

١٢. بەهەشت گیان، کاتێ بە پیلانی زایۆنی جیهانی خۆڵ کرایە چاوی ئەمانە و هەم وێنەکانیان ئیتر ڕێگای ڕاست و جێگای دەستی تاقە خوایـان لێـون بـوو . جـا کـاتێ بـەنگ و تلیـاکی

---

[26] (کتاب الفلسلة)، بۆ پۆلی حەوتەمی ناوەندی وڵاتی تونس، دانانی لیژنەی نەتەوایـەتی تـونس بـۆ فەلسـەفە (البیـدالوجي) وەزارەتـی پـەروەردەی تـونس، چاپخانەی دار الحریة، بغداد، ١٩٧٧، بەرگی یەك، ص٤٩٩.

[27] سورة الواقعة ومنهجها في العقائد محمود غریب، الدار العربیة للطباعة، بغداد، ١٩٧٧، ص٩١-٩٢.

ماددیـەت مرۆڤـی سەرخۆشـکرد و هـەموو ژیریـی و هەسـت و هۆشی بە دیار ماددەوە بەند کرد، ئیتر هەموو شێتەڵێکی ژیـان و هـەموو بۆچـونێکی دیـاردەی سروشـت و هـەموو هۆیـەکی گەشەکردن و دروستبون و ڕێکوپێککردنی پارچەکانی بونەوە و هتد، شیتەڵێکی پـووچ و بۆچوونێکی لـەق و لـۆق دەردەچێت، ئەو یاسا وردە و ڕژێمە خواییەی دروستکەر و هەڵسوڕێنەری ئەم بونەوەرەیە زۆر قوڵترە لەوەی بە گەشتێکی (داروینی)، یان بە تیۆرێکی سەرچڵی تەواو بێ و بگاتە ئەنجامێکی ڕاستەقینە، خوا ئەفەرمووێ: { إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ } ( القمر : ٤٩ )

واتـە: ئێمـە هـەموو شـتێکمان بـە ئەندازەیـەکی زۆر ورد و یاسایەکی ئەندازیاریی خوایی دروستکردووە، ئەو (ئەندازە)یە نـابێ تێکبچـێ و هـەر دروسـتکراوێك هـەر زینـدەوەرێك هـەر خانەیەکی زیندوو لەم ژیانەدا دەورێکی دیـاریکراو و تەمەنێکی دیاریکراو و جێگایەکی دیاریکراوی هەیە[٢٨]، نە پەیوەندیی بە زۆردار و بێـزۆر و نـە بـە هەڵبـژاردنی سروشـتی کـەڕ و کـوێر، دانراوە، لـە هـەر کاتێکدا زینـدەوەرێك ویسـتی لـە بـەرەی خـۆی زیـاتر پـێ رابکێشـێ، تۆڵـەی خـۆی وەرئـەگرێت و قاچـی

[٢٨] (رؤية علمية الإيمان) موحەممەد رەشید ئاکرەیی، چاپخانەی (الجمهورية) موسڵ ١٩٧٧، ص٢٦.

ئەبڕرێتــەوە، وا لــە خــوارەوە دوو نمونــەی قــاچ بڕینــەوە و ڕێکخستنی زیندەوەرەکان و بڕینەوەی دەستی زۆردار ئەخەمە بەردەست[٢٩]، بەهەشت خۆت ویژدانت بزانە ئایا ئەمانە جێگای دەست و نەخشەی خواییمان نیشان ئەدەن، یان هەڵبژاردنی سروشتی (الإنتخاب الطبيعي) ؟

نمونـەی یەکـەم: لـەم سـاڵانەی دواییـدا لـە ئـەمریکا جـۆرە چۆلەکەیەکی دەنوك سور کەوتە ناو کێڵگەکانی ئەمریکاوە و زیانێکی زۆری دا لە جوتیارەکان و بووە هۆی هاتنە خوارەوەی ڕەنووسی بەرهەمی (الرقم الأنتاجي) لەبەرئەوە کاربەدەستانی ئـەمریکی هەسـتان بـە دروسـتکردنی لیژنەیـەکی پسـپۆڕ بـۆ قەلاچۆکردن و لەناوبردنی ئەم جۆرە چۆلەکانە و بەخشیش و خەلاتی ئەدا بە هەر کەس زیاتریان لێ بکوژێت، بەڵێ لیژنەکە تا ڕاددەیەك لە کارەکەیدا سەرکەوت و چۆلەکەکان کزبون و خەریك بوو لیژنەکـە هەناسـەیەکی پشـوودان بـدات و دڵخۆشـی خـۆی دەرببڕێت، بەڵام ڕووداوێکی سەیر ڕوویدان ئەویش ئەوەبوو بە نەمانی ئەو چۆلەکانە جۆرە مێروویەك پەیدابون و بەربونە گیانی کشتوکاڵەکانیان و بە هیچ جۆرە داودەرمانێك چارەسەر نەئەکرا، بۆیان دەرکەوت کە ژیانی ئەو چۆلەکانە لەسەر خواردنی ئەو

---

[٢٩] (سروشت لە تەرازووی ژێریدا) موحەممەد مەلا ساڵی شارەزووری، دار العربية للطباعة، بغداد، ١٩٧٧، ل١٧، نمونەی گیادڕکاوییەکەی ئوسترالیا.

مێژووانەیە، بۆیە لیژنەکە قەوانەکەی هەڵگەڕاندەوە، جاران کە خەڵاتی ئەدا بە هەر کەسە چۆلەکەی زیاتر بکوژێت، ئەمڕۆ بڕیاری تۆڵە و سزادانی دەردەکرد بۆ هەر کەسە لەو چۆلەکانە بکوژێت[٣٠]، ئێمەی مرۆڤی کەم بیر و کورتبین چوزانین کامە باشترە بۆمانەوە و کامە خراپە!؟

نموونەی دووەم: بگەڕێینەوە بۆ کتێبی (گەشتەکەم...)[٣١]، گوێبگرین لە دکتۆر مستەفا مەحمود، چی دەڵێ: "ئەو شەوەم لە یاد ناچێ کە پێش چەند ساڵێك لەمەوبەر لە گەڕانەوەمدا بۆ (ئەدگاڵی) لە ئەفریقای ناوەڕاست، بە (نیل)ی پاندا و بە کەشتییەکی سەرگیراو ئەڕۆشتین، هەتا لە (مەلگان) ڕەت بووین و گەشتینە جێگایەکی پڕ لە مێشوولە، نیلیش لەو شوێنەدا بوو بووە کۆمەڵە گەنگاوێك و بە شێوەیەك پان و پۆڕ بووبوو، ئەو بەریمان بەدی نەئەکرد، کەشتییەکە لەبەر ناسازی شوێنەکە ئەتوت بە جێگایەکی خلیسکدا تێپەڕ دەبێ، بەلام ئەزانی مێشوولە چی پێکردین؟

[٣٠] (الداروينية ، عرض وتحليل) يحي محمد، ص٢١٧.

[٣١] گەشتەکەم لە گومانەوە بۆ باوەڕ، نوسینی د. مستەفا مەحمود، وەرگێڕانی موحەممەد مەلا ساڵحی شارەزووری، چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی، ١٩٧٥، ل٥١.

ئەوەنـدەی گەسـتین هەرچـی لـە نـاو کەشـتییەکەدا بـوو، بـە کەشتییەوانیشـەوە نـەخۆش کـەوتن؛ بـەڵام مـن بـە شـێوەیەکی ڕێکوپێك حەبی (کامۆکین)م قوت ئەدا بۆ ئەوەی تووشی لەرز و تا نەبم، شەوێك لەو شەوانە ویستم بڕۆمە سەر کەشتییەکە، بۆ ئەوەی سەیرێك بکەم، بۆیە دەست و دەم و چاوم بە ڕۆن ساوی و چـەورم کـرد و سـەرکەوتم بـۆ سـەر کەشـتییەکە، بـەڵام کـاتێ چوومە سەرەوە چیم دی؟

ئـەتوت خـەو ئـەبینم! سـەیرم کـرد بـە هـەزاران پـەلی درەخـت دائەگیرسـێن و ئەکوژێنـەوە، ئـەتوت جەژنـە و منـاڵان فیشـەکە شێتەیان بە سەردا هەڵداون، یان ئەتوت بە پەردەیەکی گڵۆپی کارەبـایی پـەل و پـۆی ئـەو دارانـە داپۆشـراون، دائەگیرسـێن و ئەکوژێنەوە، دەستێکم هێنا بەسەر چاوەکانمدا ئەوەك ڕێچکە و پێچکە بکەن کە چاوم هەڵهێنایـەوە سـەیرم کـرد ئـەوەی دیومـە ڕاسـتەو خـەو نییـە، ئـەتوت درەختـەکان داپۆشـراوی گڵـۆپی کارەبایین، هەتا پرسیارم لە کەشتییەوانەکە کرد و وتی: ئەوەی کە دیوتە خەو نییە و ڕاستە، ئەمانە کرمی (گۆئەستێرەن) و خوا بۆ ڕاوە مێشوولەی ئەم ناوە لێرە کۆی کردوونەتەوە، ئەو کاتەی کـە ئـەگرێت بـەو گـڕە مێشـولە بـۆ لای خـۆی ڕائەکێشـێت و ئـەیگرێت و ئـەو کاتـە کـە خـەریکی خواردنیـەتی گڕەکـەی ئەکوژێنێتـەوە، بـۆ ئـەوەی (چـارج_ شـحن)ی بکاتـەوە بـۆ

داگیرساندنێکی تر و ڕاوە مێشوولەیەکی تر، ئەمە کردەوە و نەخشە و ئەندازەی نەگۆڕاوی خواییە، هەر کاتێک شتێک، گیاندارێک، زۆر بوو لە ئەندازەی دیاریکراوی خۆی دەرچوو، خوا ملۆزمێک و دژێکی بۆ ئەنێرێ بۆ ئەوەی بیگەڕێنێتەوە بۆ سنورەکەی خۆی و یەکسانی لە نێوان دروستکراوەکانیدا بمێنێ و هیچیان هیچیان دانەپۆشن و لە سنوری دیاریکراوی خۆیان دەرنەچن"[٣٢]، بەڵێ ئەمە سنوری خواییە و زۆر بەرزترە لە ژێری کەل و کوێری سروشت پەرستان، ئەم جیهانە پان و بەرینە و ئەم بونەوەرە فراوانە و نەخشە وردەکانیان بەڵگەن لەسەر دەستێکی بەهێز و زاڵ بەسەریدا، بەهەشت گیان، ئەم گورز و مەیدانە زۆر بەهێزترە لە بیری (هەڵبژاردنی سروشتی)

ئایا دانانی زەوی لەم شوێنەی ئێستای و دور و نزیکی لە خۆرەوە، هەر سروشتییە؟ ئایا ڕێژەی دروستبونی هەوا و گۆڕینەوەی لە نێوان گیاندار و ڕووەکدا هەر هەڵبژاردنی سروشتی بوو؟ ئایا دانانی قەوارەی زەوی بەم شێوەیەی ئێستا هەیە، هەر هەڵبژاردنی سروشتی بوو؟

کە ئەگەر گۆی زەوی لەوەی ئێستا بچوکتر بوایە (هێزی کێشکردن)، یان ڕاکێشانی کەم ئەبوو، بەرگە هەواییەکەی نەئەما

---

[٣٢] رحلتي من الشك الى الإيمان، د. مصطفى محمود، دار العودة بيروت، ١٩٧١، ص٩١- ٩٤.

و ژیان نەئەما لەسەری، ئەگەر قەوارەی گۆی زەوی لەمەی ئێستا زیاتر بوایە جموجوڵ زۆر گران ئەبوو، لاشەمان بار ئەبوو بەسەرمانەوە، هەزاران و ملیۆنەها ئایا و ئایا، کە ئابڕووی (هەڵبژاردنی سروشتی) و سروشت پەرستان و سروشت دەبا و نرخیان ناهێڵێ.

بەهەشت گیان، گەورەترین کۆسپی ڕێگای ئەم ماددییانە ئەوەیە کە بەشێکی بونەوەر لە بەشەکەی تری جیایەکەنەوە و بە یەك تۆپەڵ سەیری ناکەن، بۆیە تووشی ئەم هەموو نەخۆشی و گەندەڵیی و لێقەومان و سەرلێشێواوی بیر و باوەڕییە ئەبن.

## خۆسازدان لەگەڵ دەوروبەردا ( الملائمة مع البيئة ) :

**بەهەشت:** کاکەگیان، یاسای سێیەمی داروین و داروینیزم بە تێکڕایی بریتییە لە (خۆسازدانی هەر گیانداریك لەگەڵ دەوروبەریدا)، مەبەستیان لەم خۆسازاندنە چییە و چۆنە و بەڵگەیان چییە و تۆ بۆچوونت چییە؟؟

**ئەورەسی:** مەبەستی داروینی و داروینیزم ئەوەیە، دەبێ هەموو گیانداریك لەگەڵ سروشتی دەوروبەریدا و ئاو و هەواو کەشی ناوچەکەدا دەبێ خۆی بسازێنێ، بەمەشەوە ناوەستێ، بەڵکو پارچەکانی لەشی گیانداران بە پێی بۆ لواندنی دەوروبەری هەموو جۆرە ڕووداوێکی بەسەردا دێت و دەوروبەر کار دەکاتە سەر هەموو ئەندام و کۆئەندامی لەش، بۆ نمونە ئەو گیاندارەی لە دۆخێکی تایبەتیی و بە خواردنێکی تایبەتی دەژی، کاتێ دۆخەکەی ئەگۆڕێ و ئەو خواردنەی چنگ ناکەوێت، ئەو گیاندارە دوو ڕێگای بۆ هەیە، یان دەبێ بە خواردەمەنی تازە خۆی فێر بکات و ئەندامەکانی جوین و ئەزم (هەرس)کردنی بگۆڕێت، یان دەبێ بمرێت، واتە شێر کە ئێستا گیاندارە گۆشتخۆرەکانە کەڵبە و ددانی تیژی هەیە و خاوەنی چنگ و قەپی بەهێزە بۆ ڕاوی گیاندارانی تر (بە پێی تیۆری داروینیزم) ئەگەر هەندێك لەو شێرانە بهێنرێن و بخرێنە دەور و بەرێك و دۆخێك کە گۆشتیان دەست نەکەوێت، چەند ساڵێکی دور و

درێــژ لــە گۆشــتخواردن دور بخرێنــەوە و بــە زۆری فێــری ڕووەکخواردن و گژوگیا خواردنیان بکەن، داروین دەڵێ: ئەو شێرانە هەندێکیان ئەمرن و هەندێکی تریان ئەبن بە گیانداری گیاخۆر و ئـەو کاتـە کەڵبـەکانی لاواز ئـەبن و نینـۆك و چنگۆڵەکانی کەمهێز ئەبن و لە ئەنجامدا هەر بە تەواوی شێوەی ددانەکانی ئەگۆڕێ و گەدە و ڕیخۆڵەکانی ئەگۆڕێت و...هتد، کۆئەندامێکی تازە پەیدا دەکات[٣٣]، بۆ ژیانی تازە و گونجاندنی تازە، داروین بەمەشەوە ناوەستێ، بەڵکو دەڵێ: ئەو خواردنە ئەگەر لەناو ئاودا دەست بکەوێ، دەبێ بە مەلەوان، ئەگەر لە هەوادا بێت، فێری فڕین دەبێ!! چۆن دالغەیەکە بەهەشت گیان!![٣٤].

بەهەشت: وەڵڵا بڵێم چی، ئەمە هیچی لە توێژینەوەی زانستی ناکات، بەڵکو دەڵێی چیرۆکی بەر ئاگردان و کوانووی کوردییە، ئەی تۆ دەڵێی چی؟

نەورەســی: بەهەشت گیان، ڕاستە کە دەوروبەر کاریگەرە بۆ پێستی مرۆڤ، ئەو مرۆڤەی لە دەوروبەرێکی گەرم و شێداردا ئەژی، ڕەنگی پێستی ئەو مرۆڤە زەردە، خۆ ئەو مرۆڤەی لە ئەوروپا ئەژی کە فێنك و تیشکی خۆر کەمهێزە، پێستێکی سپی

---

[٣٣] (أصل الأنواع)ي داروين، ص٢٨٥-٣٢٦.

[٣٤] عن إنسان والداروينية، هادي المدرسي، ص٢٢-٣٣.

تەنکیان هەیە و خوێنەکەیان لە ژێر پێستە تەنکەکەیانەوە دیارە و سور و سپی دەردەچن، خۆ ئەگەر بڕۆین بەرەو وڵاتی (ئەسکیمۆ) کە زۆربەی تەمەنیان بەفر و سەهۆڵبەنداندا بەسەر دەبەن، سەیر دەکەین پێستەکەیان لەگەڵ ئەو دەوروبەرەدا هاتووە و بەرگە گرە؛ یان وەك جیاوازیی نێوان ورچەکانی ناوچە تەوەرییەکان و ناوچە کەمەرەییەکان، وەك لە سەرنجەکانی داروینداباسمان کرد، ئەم سەرنجانە ڕاستن، بەڵام بەهەشت گیان هەرگیز دەوروبەر ناتوانێ گیاندار بگۆڕێت، هەرگیز ناتوانێ مەیمون بکاتە فیل و مرۆڤ بە ئەسپ، یان سەگ بە شەمشەمە کوێرە، زانای پایەبەرز (د.سوریال) دەڵێ: "ئەو جیاوازییەی دەوروبەر کاریگەرن لەسەر گیانداران تەنها کاریگەری ڕووی دەرەوەی گیاندارانن، هەرگیز کار ناکەنە سەر نەژاد و (جەوهەر)ی گیانداران"[٣٥].

٢. پرۆفیسۆری زیندەوەرزانی (بن) هەستا بە تاقیکردنەوەی مەسەلەی دەوروبەر لەسەر گیانداران و هێنای کۆمەڵێك (مێش هەنگ)ی خستە تاریکایی و هەتا شەست و شەش وەچە (پشت) نەیهێشت بە هیچ شێوەیەك ڕوناکی ببینن و پاش هەڵهاتنی وەچەی شەست و شەشەمەین نەوە کە هاتنە جیهانی ڕووناکی

[٣٥] تصدع مذهب داروین والإثبات العلمي لعقیدة الخلق، د.حلیم عطیه سوریال.

بە هیچ شێوەیەك کۆئەندامی بینین و چاویان گۆڕانی بەسەردا نەهاتبوو، ئەم ماوە و ئەم هەموو وەچە و پشتاوپشتە هیچ دەوروبەری ژیانیان کاری تێنەکردن و ئەم تاقیکردنەوە هەوای تایەی داروینیزمی فش کردەوە[٣٦].

٣. بەڵێ، ڕاستە مارمێلکەی ئەشکەوتە تاریکەکان کوت و کوێرن و مارمێلکەی دەشتەکان چاودار و بینا و ڕەنگاوڕەنگن، بەڵام ئەمە نابێتە ڕێسا و بساورێتە سەر هەموو گیانداران، بە هەزاران گیاندار ئەبینین لە تاریکستان و ئەشکەوتە تاریکەکان و درزی زەویدا ئەژین و هەرگیز (بە دەگمەن نەبێ) تیشك و ڕوناکی نابینن، کەچی چاوێکی تیژ و هێزێکی بینایی تەواویان هەیە، ئەوە (کونەپەپوو) کە هەموو ژیانی ڕۆژانەی لە تاریکایی ئەشکەوتەکاندا بەسەر دەبات، لە ترسی تیشك و ڕوناکی دەرناچێت، کەچی خاوەنی ئەو چاوە جوانانە و ئەو دیتنە تیژەیە، بە ڕاستی لەم مەسەلەی کاریگەری دەوروبەرەدا، داروینیزم وردبین نەبووە، هەر گیاندارێکی دیبێ، نەختێك جیاواز لە گیاندارانی هاو وێنەی، یان گیاندارانی دەوروبەری، یەکسەر داویەتیە دەست دەوروبەر و کارتێکردنی دەوروبەر، بۆ نمونە: داروینیزم دەڵێ: (باڵن) کە گیاندارێکی ئاویی زۆر

---

[٣٦] (عن الإنسان والداروينية)، هادي المدرسي، ص٣٤.

گەورەیـە، لـە ئاودا دەژی، بێجگە لـەو دوو پەڕەکـەی وەك هـەموو ماسییەك هەیـەتی، دوو (پـێ ـ قاچ)ی بچووکی هەیـە، جا دەڵێن: ئەمە کاتی خۆی گیاندارێکی وشکانی بووە و نیشتووەتە ئاو و بووەتە ئاوی و بە زۆری پێداویستی دەستەکانی بووەتـە پەڕەکە و قاچەکانی هەر وا ماوەتـەوە، بەڵام ئەمە وا نییە، چونکە هەر لـەو شـوێنانەی (بـاڵن)ی تێـدا ئـەژی (ژێـر دەریاکـان)، هـەزاران گیاندار هەیە دەستی هەیە و قاچی هەیە و پەڕەکەشی لێڕوواوە.

٤. ئەگـەر کاریگـەری دەوروبــەر بــەو شــێوەیە بوایــە، مــرۆڤ نەیئـەتوانی بەرامبـەری بووەسـتێ، کەچـی وا نییـە، ئـەوەتا بـە چـاوی خۆمـان ئـەبینین کـە مـرۆڤ کاردەکاتـە سـەر دەوروبـەر و شارسـتانییەت دروسـت دەکـات و هـەوای سـارد گـەرم دەکـات و هەوای گەرم سارد دەکات، دەوروبەر لەگەڵ خۆیدا ئەگونجێنێ و زاڵ دەبێ بەسەریدا، هـەروا هـەر گیانـدارەی بە پێـی توانا لەگـەڵ دەوروبەرەکەیدا بەرامبەری و بەرگری دەکات.

٥. هەڵەشەیی داروین لەم کاریگەری دەوروبەرە لەسەر گیانداران بە تەواوی ڕوونە، داروینیزم لای وایە بۆیە پیاو ڕیش و سمێڵی هەیـە و ئـافرەت نییـەتی، چـونکە پیـاو لەبـەر سـوڕی هـەتاو کاریکردووە و لەبەر خۆر ڕیش و سمێڵی لـێ دەرهاتووە، بەڵام چـونکە ئـافرەت کـەمتر لەبـەر هـەتاو ژیـاوە، وا ڕیـش و سمێڵـی نییە، بەڵام ئەمە کەی ڕاستە!!؟

جارێ هەر لە سەرەتای ژیانی ئادەمیزادەوە تا ئێستا و ئێستاش لە لادێکاندا ئافرەت شانبەشانی پیاو لەبەر سوڕی هەتاو ئارەق ئەرێژێ و جوتیاریی و گێرە و کێشە و درەو و...هتد دەکات، خۆ لەو کاتەوە شارستانییەتی تازە پشووی بە ئادەمیزاد داوە، لەو سێبەر و پشوودانە پیاو و ئافرەت وەك یەك لە ژێر سێبەردا بون، کەچی هەر پیاو ڕیشدار و ئافرەت ساف و لووسە.

٦. ئەگەر دەوروبەر ئەوەندە کاریگەرە (بە خەیاڵی داروینیزم) بۆچی تەنها کاری لە گیاندارە بڕبڕەدارەکان کردووە و گیاندارە بێبڕبڕەکان وەك خۆیان ماونەتەوە، کەچی هەردوو بەرەکە بە یەك قۆناغ و لە یەك کات و لە یەك دەوروبەردا ژیاون و یەك وەچەن[٣٧].

بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت ئەو کاریگەرییەی دەوروبەر هەیەتی ناگاتە پلەی گۆڕاندنی گیاندارێك بۆ جۆرە گیاندارێکی تر، یان پەیدابونی گیانداری تازە.

---

[٣٧] الإنسان والداروينية، محمد صالح كريم خان، ص٢٤٨.

## یاسای (بۆماوە) بنەما و بازدان (الوراثة والفطرة)

**بنەما:**

**بەهەشت:** یاسای چوارەم و دوا یاسای داروینی بریتییە لە یاسای (زگماکی و بنەما و بازدان)، بەڵام کاکەگیان پێش ئەوەی هیچم لەم بارەوە بۆ باس بکەیت، با ئەوەمان لە بیر نەچێت کە تیۆرەکانی (لامارکی و داروینی) لەم ڕووەوە هەموویان شکستیان خوارد و ئەوانەی کە زۆر داروینباز بون؛ لەم یاسای داروینییە پاشەکشەیان لێکرد و سفرێکی زەق نەبێ هیچی تری بە دەستەوە نەما؛ بەڵام داروینیزمی نوێ چەکێکی تازەیان لێدا و بۆچوونی نوێ و بەڵگەی تازەیان بۆ داڕشت، کە داروین نەیبیستووە، بۆیە حەز ئەکەم ئەم باسەم نەختێك بە وردی بۆ باس بکەیت؛ یاساکە لە ڕوانگەی داروینی کۆن و نوێ و بۆچوونی زانستی بۆماوەزانی لەم بارەوە چییە؟

ئەگەر بە پەلەش بێ بۆم باس بکە، خوا پاداشتی خۆماندوکردنەکەت بداتەوە و تۆم لێنەسێنێ.

**نەورەسی:** بەڵێ بەهەشت گیان، داروینی کۆن لەم بوارەدا زیاتر لە بوارەکانی تر شکستی هێنا؛ داروینی کۆن لای وایە ئەو بەهرانەی نەوەی نوێ دەستیان دەکەوێت، ئەگوێزرێتەوە بە شێوەیەکی گەشەتر و چاکتر بۆ وەچەی داهاتوو.

داروین دەڵی: (مایینە بەحری ـ زەڕافە) لە کاتی خۆیدا لـە دەشـت و لەوەڕگەیـــەکی نەرمانیـــدا دەژیـــا، بۆیـــە ملـــی وەك هـــەموو گیانـدارێکی تـر دەشـتەکی وا بـوو، بـەڵام دوایـی گـژوگیای ئـەو جێگایە بە هۆی بێبارانییەوە ڕووی لە کزی کرد، لـەوەڕ نـەما بۆ زەڕافە، لەبەرئەوە برسێتی زۆری پێهێنـا و ئـەمجا دەمیان لەسـەر زەوی گواستەوە بۆ پـەلی درەختـەکان، نازانین ئـەی درەختـەکان چۆن وشـك نـەبون، ئاشکرایە داروین پـێش هـەزاران سـاڵ خـۆی لەوێ بووە، وا چاکتر ئەزانێ، سەنگی ژیـان و پشتەسـووری پـەل و پۆی درەختەکان بون، جا ئەوەندە دەمیان بـەرزکردەوە، ملیـان (وردە وردە و وەچە وەچـە) درێـژ بـوو، بـەو شـێوەیەی کـە ئێسـتا ئـەیبینین، ئـەم گواسـتنەوەی مـل درێژییـە لـە وەچـەیەکەوە بـۆ وەچەیەکی تر، داروینی پێی دەڵێن بازدان و هـەڵگرتنی سیفەتی نـەوەی پێشـوو بـۆ نـەوەی داهـاتوو بـۆ گونجانـدن و خۆسـازدانی گیاندارانی وەچەی تازە لەگەڵ شێوەی خواردن و ژیـانی تـازە، داروینـی کـۆن ئەیـەوێ ئـەم یاسـایە بکاتـە یاسـایەکی گشـتی و بیچەسپێنێ بەسـەر هەموو زیندەوەرەکاندا، تەنانـەت (مـرۆڤ)یش، لامارك دەڵی: "ئەو مرۆڤە ئاسنگەرە پیك و چەکوش وەشێنە بە مانەوەی ماوەیەك لەسەر ئەو پیشـەیە دەسـت و مەچـەکی لەگـەڵ

کارەکەدا ڕادێت و هەڵسوڕاندنی ئەو چەکوش و پیکە زۆر لای ئاسان دەبێ و ماسولەکانی بەهێز و لاشەی بەرگەگر دەبێ"[38] ، بەڵام ئەم سیفەتە تازەیە ناگوێزرێتەوە بۆ کوڕەکەی و سیفەتێکی بنەما (بۆماوە)یی دانانرێت وەك لامارك وا ئەزانێ.

ئـەم شـیتەڵکردنەوە و نموونانـە هیچـیان زانسـتیانە نـین[39]، خۆشیان پاشەکشەیان لێکرد، چونکە ئایا ئەو هێز و بازوو و ڕاهاتنەی ئاسنگەرەکە ئەگوێزرێتەوە بۆ کوڕەکەی!!؟ ئایا کوڕی ئاسنگەرەکە ماسولکەی بەهێز و پیکوەشێن ئەبێ؟

دیارە نەخێر، کوڕەی ئاسنگەر وەك هەموو کوڕێکی تر، بەهێز و بێهێـز و لـەڕ و لاوازیـان تێدایـە و هـیچ ڕاهـاتنی بـەر ئاگر، یـان ئاسـانی چـەکوش وەشـاندنەکە ناگوێزرێتـەوە بـۆ وەچـەی نـوێ ، لەبەرئەوە بۆچوونی داروینی کۆن وازی لێئەهێنین و دێینە سەر

---

[38] هـەر جـارەی کـە زانسـت پشـتی داروین نەشـکێنێ، هـەوڵی ڕاسـتکردنەوەی لامارکی ئەدەن، کە گوایە لامارکی جیایە و داروینی جیایە، یان لامارکی شکا پـەلاماری داروینـی ئـەدەن. کـاتێ داروینـی. کـۆن و کەلەبـەرەکانی زۆر بـوون، زانایـەك بە نـاوی (سـتیل) هەسـتاوە و ئەیـەوێ چەکوشکاری و پینـەی لامارکی بکـات و ڕاسـتی بکاتـەوە. سـەیری گۆڤـاری (الدوحـە)ی وەزارەتـی ڕاگەیانـدنی قەتەر، ژمارە٥٨ی ساڵی پێنجەم، ئۆکتۆبەری ١٩٨٠، ص٧٨-٨١بکە.

[39] (انسـان الإنسـان رينيـة دۆبـۆ، ص١٠٠.، (تطـور الجـنس البشـري، د.محمـد السـيد غـلاب، ص٢٤. نظريـة التطـور بين العلـم والـدين، علـي احمـد الشـحات، مؤسسة الخاني، قاهرة، ص٣٧.

بۆچوونی داروینیزمی نوێ، یان ڕاستترە بڵێین (پەنجەپینەی داروینی)، بەڵام بۆ ئەوەی لەو مەبەستانە بگەین، با بەسەر پێیەکەوە باسی (خانە و کرۆمۆسۆم و جین) بکەین، ئەو کاتە لە یاسای بنەما و بازدانی بنەمایی تێئەگەین.

**بەهەشت:** باشە فەرموو.

**ئەورەسی:** خانە، یان (سێڵ) بریتییە لە یەکەمین بەردی بناغەی هەموو جۆرە ڕواڵەتێکی ژیان، ئیتر ئەو ژیانە هەرچۆنێك و هەر چەشنێك هەبێت، خانەش بریتییە لە جێگا و نهێنگای ژیان، خانە لە گرۆیەکی پرۆتۆپلازمی پێکهاتووە، کە بە پەردەیەك داپۆشراوە، ئەم پەردەیە هەڵدەستێ بە ڕێگادانی هەر شتێکی پێویست لە دەرەوەی خانەکە بۆ ناوەوە، یان لە ناوەوە بۆ دەرەوە، لە ناو ئەو پەردەیەشدا شلەیەکی تێدایە کە پێی ئەوترێت (سایتۆپلازم)، کە ئەم سایتۆپلازمەش هەوێنی ژیانە و ئەگەر خانە لە سایتۆپلازم چەك بکرێت، ناتوانێ ڕێگای ژیان ببڕێت، چونکە سایتۆپلازم مەڵبەندی مژین و جوین و هەرس و دەردان و هەناسەدانی خانەیە، خۆ ئەگەر سەرێك لە ناوکی خانە بدەین بۆمان دەردەکەوێت کە سەرکردایەتی خانە و دانانی ڕێرەوی ژیان لەوێدایە، چونکە ناوك زاڵە بەسەر هەموو کار و فرمانێکی خانەدا، ئەوەی کە ئێمە لە باسی خانە پێویستمانە بەشی ناوکە، چونکە ناوك (هۆ بنەماوەکان - العوامل الوراثیة)،

یـان بلـێین (جینـەکان) ئەگوێزێتـەوە لـە وەچـەیەکەوە بۆ وەچـەی داهاتوو.

بەهەشـت گیـان، ئەگـەر بـەراوردێکی ئـەو خانـە زینـدووەی ئـەو ئادەمیزادە گەورە مەزنەی لێدروست دەبێ بکەین لەگەڵ هێلکەی بۆقدا سەیر دەکەین هێلکە (گەرا)ی بۆق سەد ملیۆن ئەوەندەی خانەی مرۆڤ گەورەترە، چونکە کێشی خانەکە بریتییە لە ($10^{-9}$ گم) ، واتـە ئەگـەر گرامێك بکـەین بە ملیـار پارچـەوە، ئەم خانـە کێشی بە ئەندازەی پارچەیەکێتی.

مرۆڤ خۆی، وەك زیندەوەرێك؛ لەو خانانە دروست دەبێ و گەشـە دەکـات و پێئـەگات، هـەموو ژیـانی بـە گـۆڕین و دروسـتبون و لابردنـی خانـەوە بەسـەر دەبات، لاشـەی مرۆڤـی ئاسایی لـە هـەر چرکەیەکدا (١٢٥ ملیۆن) خانە ئەگۆڕێت، واتـە: لـە یـەك خولەکدا (٧٥٠٠ملیۆن) خانە دەکاتە سوتەمەنی و خۆراکی خۆی[40].

بەهەشت گیان؛ وەك وتمان ژیان و بونی هەموو مرۆڤێك (هەموو زینـدەوەرێکیش) لـە یـەك تاقـە خانـەوە دەستپێدەکات و دوایـی بـەش بـەش دەبێ و لـە دروسـتکردنی هـەزاران و ملۆنـەها خانـە؛ شانە پێك ئەهێنن و شانەکان کۆئەبنەوە ئەندام پێکئەهێنن و ئەندامەکان کۆئەبنـەوە کۆئەندامـەکان پێکئـەهێنن وە هـەموویان

---

[40] (الطب محراب الإيمان)، د.خالص الجلبي، بەرگی یەك، مؤسسة الرسالة، ١٩٧١، ص٤٠.

لاشـەی ئـادەمیزاد پێکئـەهێنن، کۆئەنـدامی هەناسـەدان، هـەرس، میزکردن، زاوزێ، سوڕی خوێن، پێست، عەسەبی، ...هتد.

چاو، هەست، گوێ، چەشتن، ...هتد.

هـەر هەموویان ئەنـدامن، لەو تاقـە خانـە پێشووەکە دروستبون، بـەلام ئـەوەی سـەر بـە هـەموو زانسـتیەکی مـرۆڤ لـە بەرامبـەر وردەکاریی دروستکەرەکەیان ئەخەوێنێ و دەستی نەزانین بەرز دەکاتەوە، چۆن ئەو خانانە بەش ئەبن؟ چۆن تێکەڵاو نابن؟

چی ناهێڵێ خانەی جگەر بێت بۆ لای سەر، یان بڕوات بۆ لای قاچ؟[41]، چ دەستێکی بـەهێز، چ نەخشـەیەکی نـەگۆڕراو جێگا و شوێن و کار و سنوری هەر خانەیەك دیاری دەکات ؟؟

{صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ }

( النمل : ٨٨ )

---

[41] زنجیرەی (٥٢)ی (الموسوعة الصغيرة) نظرات في علم الوراثة، د.عبدالاله صادق، ١٩٧٩، ص١٧٦.

جین (صبغیات): بریتییە لە هەڵگری سیفەتی باوان (چۆنێتی باوك و دایك) کە لەسەر کرۆمۆسۆمەکانن، ئەیگوێزنەوە بۆ (کۆرپە)؛ هەرچەندە کاریگەری جین لەسەر دروستبونی کۆرپەلە زۆر روونە، بەڵام زانستی تازە هێشتا زۆری ماوە لە دەستنیشانکردنی جێگای ڕاستەقینەی جینەکان لەسەر کرۆسۆمەکان تێبگات، تێبگات چۆن ئەو (شریتە) دوور و درێژە تۆمارکراوە لەسەر باوك و دایك و چۆن ڕوونووس ئەکرێتەوە بۆ کۆرپە و نەوەی تازە[٤٢]، لە کوێ ئەم هەموو زانیاریانە تۆمارکراون و لە کام یەخچاڵدا بەستێنراون، ڕەنگی پێست، ڕەنگی قژ، ڕەنگی چاو، باڵای کورت یان درێژ، چۆنێتی دەنگ، تەختی تەوێڵ، چۆنێتی برژانگ، چەناکە، دەم، ددان، لێو، مل، شێوەی پێکەنین، لووت، چاو، برۆ، سنگ، جومگەکان، گروپی خوێن، نەخۆشی بۆماوە، شێوەی کەللەسەر، ترسنۆکی و ئازایەتی، زیرەکی و تەممەڵی... هتد

چۆن ئەم هەموو زانستی و زانستانە لەسەر ئەم (جینە) جێگای بوورەتەوە، کە جینەکان بە گەورەترین میکرۆسکۆبیش بە تەواوی بە دی ناکرێت؟؟ تەنانەت زانست نازانێ (تا ئێستا) کام جینە بزێو و کاریگەرە و کام جینەی تەممەڵ و خاڵییە لە زانستی.

---

[٤٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٧٤.

جا بەهەشت گیان، ئەم جینانە کاریان گواستنەوەی ئەو هەموو زانستیانەیە لە باوك و دایکەوە بۆ منداڵ و چاپکردنی شێوەی کۆرپەکە و چۆنێتی کۆرپەلەکە لەسەر ئەو زانستیانە[٤٣]، پێویستە بزانین کە ژمارەی جینەکان وەك (کرۆمۆسۆمەکان) دیاریکراو نییە، بەڵکو ژمارەی جینەکان زۆر زۆرن، جاری وا هەیە هەر کرۆمۆسۆمێك زیاتر لە هەزار (جین) هەڵئەگرێت، واتە: باوك و دایك هەڵئەستن بە تێکەڵاوکردنی (٤٦٠٠٠) جین و زیاتر یان کەمتر، بۆ دروستبونی کۆرپەکەیان[٤٤]، ئەی ئەو هەموو سیفەت و شێوە و...هتد، چ دەستێك هەیە کامیان هەڵبژێرێ و کامیان بخاتە پشت کەنوو، هەتا بەو شێوەیەی دوایی دەردەچێت، دەربچێت؟

بەهەشت گیان، لێرەدا پێویستە دەستنیشانی یەکێك لە موعجیزەکانی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ بکەین، (جین) وشەیەکی ئەغریقییە (یۆنانی کۆن) و مانای (ڕەگەز) ئەبەخشێت و لە زمانی عەرەبیدا پێی دەوترێ (عرق)[٤٥].

---

[٤٣] (اْنسان بين الخلق و التطور)، محمد حسن آل ياسين، بەرگی یەکەم، چاپخانەی (المعارف) بەغداد. ١٩٧٦، ص٦٣-٧٠. بەرگی دووەم، ساڵی ١٩٨٠، ص٨١-٨٥.

[٤٤] تطور الجنس البشري، د. محمد السيد غلاب، ص٢٦.

[٤٥] نظرات في علم الوراثة، د. عبدالاله صادق، ص٩.

سـەیر دەکـەین پـێش (١٤٠٠) سـاڵ پێغەمبـەری ﷺ پێشـەوا و مامۆستامان فەرموویەتی: (تزوَّجُوا في الحجرِ الصالَح، فإنَّ العِرقَ دَسَاس)

واتە: ئافرەتانی شیاو هەڵبژێرن بۆ هاوسەریتان، چونکە (ڕەگەز، جین، عرق) شت دزە، پیلان گێرە، ئەگەر بە وردی سەیری ئەم فەرموودەیـە بکـەین بۆمـان دەردەکـەوێت کـە پێغەمبـەر ﷺ زانیویـەتی جینـەکان نەخۆشی بۆماوە و خووڕەوشتی بنەماوی ئەگوێزنـەوە لـە هـۆزەوە بـۆ کۆرپـە و نـەوەی نـوێ (بـەهۆی جینـەکانی بـاوك و دایکـەوە)، دیسـان پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئەفەرمووێ: (إغتَرِبُوا لا تُضَوُوا)، واتـە: هـەر کاتێك ژنتـان هێنـا، هەوڵبدەن کچە بێگانە بهێنن (واتە خزم و کەسوکاری خۆتـان، لـە ئامۆزا، یان خاڵۆزا، یان وێنەکانیان مەهێنن) با لاواز نەوەو پووچ تۆ و ئۆجاخ کوێر نەبن.

ئێستا لە زانستی (بۆماوەزانی) توێژینەوەیـەکی قووڵ هەیـە و زانیویانە کە ژنهێنان لە خزم نەك تەنها باش نییە، بەڵکو دەبێتە هـۆی خەفـەبونی وزەی کۆرپـە و بڵاوبونـەوەی نەخۆشـی لـەو هۆزەدا، چونکە ئەگەر نەخۆشییەکی بۆماوەیی لەو هۆزەدا هەبێ، ئەو کوڕەی کە ژن ئەهێنێ، یان ئەو کچەی کە شوو دەکات، لە بێگانـە ژن بهـێنێ، یـان شـوو بکـات بـە بێگانـە، سـەرهەڵدانی

نەخۆشـییەکە، کـز دەبـێ، یـان خەفـە دەبـێ، بـەڵام ئەگـەر لـە هۆزەکەی خۆی هێنای، یان شووی کرد، ئەوا لەویشدا هەیە و نەخۆشییەکە زیاتر دەبێ و بەهێز دەبێ، سەیری ئەم خشتەیەی خوارەوە بکە و ئەو کاتە بڵێ: (ڕاستت فەرموو ئەی پێغەمبەری لێزان و پێشەوا ﷺ)[٤٦].

خشتەی مردنی منداڵ بە هۆی ژن و ژنخوازیی خزمەوە،زانایەکی یابانی لە شاری (هێرۆشیما) سەرژمێرییان کردووە

تەمەنی منداڵ ١-٨ساڵان

| جۆری ژنهێنان | ژمارەی لەدایکبووان | ژمارەی مردووان | ڕێـژەی سـەدی مردووان |
|---|---|---|---|
| ژن و مێرد: ئامۆزا × ئامۆزا | ٣٢٦ | ١٥ | ٪٤.٦ |
| ژن و مێرد: ئامۆزا × ئامۆزازا | ١٠١ | ٣ | ٪٢.٩٧ |
| ژن و مێرد: ئامۆزازا × ئامۆزازا | ١٣٩ | ٣ | ٪٢.١٨ |
| ژن و مێرد: بێگانە | ٥٤٤ | ٨ | ٪١.٤٧ |

[٤٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٥٩. (الله والعلم الحديث)، عبدالرزاق نوفل، مؤسسة دار الشعب، القاهرة، ١٩٧٧، ص١٨١.

کرۆمۆسـۆم: لـه پێشـەوە وتمـان کرۆمۆسـۆم بریتییـه لـه هـەڵگرانی جینەکان، بەڵام ڕاستتره بڵێین کرۆمۆسۆم قاڵبی داڕشتنی هەر زینـدەوەرێك و جیاکـەرەوەی هـەموو جۆرەکـانی زینـدەوەر و گیاندارەکانه له یەکتری، ژمارەی کرۆمۆسۆم له هەر گیاندارێکدا نەگۆڕراوە و هەر زیندەوەرێك چەند کرۆمۆسۆمی هەبێ، هەموو گیاندارەکانی هاوچەشنی، ئەوەندە کرۆمۆسۆمی هەیه .

بۆ نموونە: مێش (٤) کرۆمۆسۆم و مەیمون (٢٤) کرۆمۆسۆم و گەنم (٢١) کرۆمۆسۆم و مریشك (٣٩) کرۆمۆسۆم و کۆتر (٤٠) کرۆمۆسۆم و بۆق (١٢) کرۆمۆسۆم و پشیله (١٩) کرۆمۆسۆم و قرژانگ (٥٨) کرۆمۆسۆم و ئادەمیزاد (٢٣) جوت کرۆمۆسۆمی هەیه و هەرگیز ناگۆڕرێت و کەم و زیاد ناکات.

بەهەشـت گیـان ، خـوا بـه خـۆڕایی نەیفـەرمووە: { وَفِىٓ أَنفُسِكُمْۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ } ( الذاريات : ٢١ )

واتە: گەورەترین نیشانه و جێدەستی خوا له خۆتان و دەروونی خۆتاندایـە، ئـەوە بۆچـی چـاو هـەڵناهێنن و ڕاسـتی نـابینن، خوشکیْ گیـان، هـەر پارچـەیەك هـەر ئـەتۆمێك هـەر خانەیـەك لـە لاشـەی مـرۆڤ دەستنیشـان بکـەیت، خـوات پـێ ئەناسـێنێ و دەسەوسانی هەموو ژیرییەك دەرئەخات.

بەهەشت گیان، هەر جووتە کرۆمۆسۆمێك لایەك لە ژیان و دارشتنێك و ئاڵوگۆڕێك لە چۆنێتی پەیدابونی ئەو گیاندارە دیاری ئەکەن .

بۆ نمونە: زۆر جار ئەبیستین کە فلانە پیاو ژنەکەی تەنها کچی دەبێ و کوری نابێ، لەبەرئەوە ژن ئەهێنێ (یان هێناویەتی) بۆ ئەوەی کوری ببێت، چونکە لای وایە تاوانی ژنەکەیەتی تەنها کچی دەبێ، ئەمیش حەزی لە کورە (با ئۆجاغی کوێر نەبێ)، بەلام ئەم بیرە هەڵەیە قورئان و زانستی تازەش بە درۆی دەخەنەوە، ئەویش دوای ناسینی کرۆمۆسۆمەکان و کارکردنیان.

ئافرەت، تەنها یەك جۆر کرۆمۆسۆمی سێکسی پێیە کە نیشانە (X)ی بۆ دادەنرێت، بەلام پیاو دوو جۆرە کرۆمۆسۆم (تۆویلکە)ی پێیە، کە ئەوانیش نیشانەی (X و Y)یان بۆ دادەنرێت، جا ئەگەر لە کاتی هەڵپێچانی منداڵدا کرۆمۆسۆمی (X)ی پیاو لەگەڵ (X)ی ئافرەت یەکی گرت، ئەوا منداڵەکە کچ دەبێت، خۆ ئەگەر کرۆمۆسۆمی (Y)ی پیاو لەگەڵ (X)ی ئافرەت یەکی گرت، ئەوا منداڵەکە کور دەبێت، واتە: X+X- کچ، X+Y- کور، کەواتە کور و کچ پەیوەندیی بە تۆویلکەی پیاوەوە هەیە، هیچ دەسەلاتێکی ئافرەتەکە و لایەنێکی

ئافرەتەکەی تێدا نییە، ئەمە بۆچوونی زانستی کۆرپەلەناسیی و بۆماوەزانییـە، کەچـی سـەیر دەکەیـن قورئانەکـەمان، پێشـەواکەی ژیانمـان پـێش (١٤٠٠) سـاڵ ئەفـەرمووێ: { أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ ﴿٣٧﴾ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ ﴿٣٩﴾ } ( القيامه )

واتـە: ئـەو مرۆڤـە سەرکەشـە بـۆ بیرناکاتـەوە، کـاتی خـۆی چـۆن دروسـتبووە؟ ئایـا تۆوێـك نـەبووە لـە ئـاو (سـپێرم) ڕژایـە نێـو منداڵـدانی دایکـی، دوایـی بـووە گۆشـت و پـارە و (گیانـدارێکی وەك زالـوو) خـوا دروسـتیکرد و نەخشـەی کێشـا و ڕێـك وپێکـی کـرد، هـەر ئـەو خوایـە لـە ئـاوی ئـەو پیـاوە (مێـرد) جووتـەی دروستکرد، جووتەی نێر و مێ. بەهەشت گیان، سـەیری ڕاناوی (مِنْـــهُ) بکـــە و بڵـــێ بـــە ڕاســـتی خـــاوەنی قورئـــان مرۆڤـــی دروستکردووە[٤٧].

بەهەشت گیان، جا ئێستا پاش ئەوەی بە پەلە (خانە و جین و کرۆمۆسۆم)مان ناسی، دێینە سەر یاسای چوارەمی داروینیزم و باسی دەکەین، وەك لە پێشەوە وتمان داروینی کۆن (یان داروین خـۆی) هیچـی لـە (جین)ەکـان نـەزانیوە، چـونکە ئـەو ترشـەڵۆکە

---

[٤٧] (آيات الله في الآفاق وفي الأنفس)، هاشم الدباغ، چاپخانەی الإرشاد، بغداد، ١٩٧٩، ص٧٩. (الله والعلم الحديث)عبدالرزاق نوفل، ص١٨٣-١٨٤. (الطب محراب الإيمان)، ص٧٧.

ناوکیانـەی کرۆمۆسـۆمەکانی لێدروستبووە لـە سـاڵی (١٩٥٢) لـە ئەزموونگـەی زانکـۆی پاشـایی لەنـدەنی و پـاش داهـاتنی میکرۆسـکۆپی ئـەلیکترۆنی دۆزرانـەوە و ناسـران، واتـە: پـاش مردنی داروین بە (٧٠) ساڵ، لەبەرئەوە داڕشتنی ئەم یاسایە لە لایەن داروینەوە زانستیانە و قووڵ نییە، چونکە داروین لای وایە (هەر جۆرە سیفەتێك بە هۆی پاڵەپەستۆی دەروبەرەوە کار بکاتە سـەر چۆنێتی گیانـدارەکان، ئـەو کارتێکردنـە ئەگوێزرێتـەوە لـە وەچەوە بۆ وەچەی داهاتوو، بەڵام ئەمە وا نییە، هەرگیز سیفەتی پەیدا (الصفات الإکتسابیة) ناگوێزرێتەوە، چونکە:

١. مەرج نییە کوڕی پزیشك، پزیشك بێ، یان لە پزیشکی بزانـێ، یان کوڕی هەستیار (شاعیر) شاعیر بێ، یـان کـوڕی هونەرمەنـد، هونەرمەند بێ.

٢. بـە پێـی تاقیکردنـەوەی (مەنـدڵ)[٤٨]، سـیفەتە پەیـدابووەکان (تەنانەت لە ڕووەکیشدا) ناگوێزرێتەوە بۆ وەچەی داهاتوو.

٣. زانایـەکی زینـدەوەرزانیی ئیتـاڵی هەسـتا بـە بـڕینی کلکـی (١٥٠٠) مشك، لە ماوەی بیست و پێنج وەچەی مشکدا، کەچی دوا مشکی دوا وەچە، بە کلکی تـەواوەوە پەیـدا بـوو، بە هـیچ شێوەیەك ئەو کلك بڕینەی ئەو وەچانە کاری نەکردبووە سەریان.

---

[٤٨] قەشە (مەندڵ) زانای بۆماوەزانیی نەمسایی بوو، لە ساڵی (١٨٢٢) لە دایك بووە و لە ساڵی (١٨٨٤) مردووە، بە باوکی بۆماوەزانی ئەناسرێ.

٤. هـەر لـە یەکـەمین پیـاو و ژن لەسەرانسـەری میـژووی دوور و درێـژی ژیـانی ئـادەمیزاددا لـەم سـەرزەوییە، پـەردەی کچـێتی (غشاء البکارة)ی هەموو ئافرەتێك ئەدڕێت، کەچی ئەو پەردەیە هەر وەك خۆی ماوە و ئەمێنێ.

٥. لە هەزاران ساڵ لەمەوبەرەوە تا ئێستا پیاوانی موسڵمانەکان و جولەکـەکان و هەنـدێکی تـر لـە مرۆڤـە خـاوەن ئاییـنـەکان (خەتەنـە) ئـەکرێن، کەچـی هـەموو کـوڕە موسـڵمانەکان، یـان جولەکە، کە لە دایك دەبێت ئەو پێستەی سەر (هەرامەکەی) هـەر هەیە، وەك هەموو مرۆڤێکی تر.

٦. زانایـەکی هۆڵەنـدی هەسـتا بـە هـۆی هۆقنـە و پێـدانی تێکەڵاوێکی (نەفتالین) و گریس و ئەیدایە چەند کەروێشکێکی ئـاوس کـە هـیچ وەچـەیەکی کوێریـان نـەبوو، بـەڵام پـاش ئـەم هۆقنەیە، هەر کەروێشکێك کە لە دایك ئەبوو، کوێر بوو، کەچی هـەر لە یەکەمین وەچە و بەکارنەهێنانی تێکەڵاوەکە وەچەکانی گەڕانەوە سەر دۆخی جاران و چاوێکی ڕوناك و ئاسایی[٤٩].

٧. زانـای بـەناوبانگ (د.سۆسـتی) لـە سـاڵانی (١٩١٥) بـە دواوە هەستا بە تاقیکردنەوەیەك لەم بارەوە، هات دوو کۆمەڵە مشکی هێنا و خستیە تاقیگەوە، کۆمەڵی یەکەمی خستە ژوورێکەوە کە

---

[٤٩] (عن الإنسان والمادية الداروينية) هادي المدرسي، ص٤٠-٤١.

پلەی گەرمای بریتی بوو لە (٢٢) پلە، کۆمەڵی دووەمی خستە ژوورێکەوە کە پلەی گەرمییەکەی (٤) پلە بوو لە ژێر سفری سەدییەوە، پاش چوار مانگ سەیری زاوزێی هەردوو کۆمەڵەکەی کرد، بینی وەچەی کۆمەڵی یەکەم جیاوازیی هەیە لەگەڵ وەچەی کۆمەڵی دووەمدا.

ئەو مشکانەی لە (٢٢) پلەی گەرمیدا ژیاون، قاچ و کلکیان درێژترە لەو مشکانەی لە چوار پلەی ژێر سفردا ژیاون.

کاتێ دەریهێنان لە ژوورەکان و هەر یەکەی بە جیا لە شوێنی ئاسایی و پلەی گەرمای ئاساییدا بەخێوکردن، سەیری کرد، وەچەی تازەی هەردوکیان گەڕایەوە سەر دۆخی ئاسایی و مشکی ئاسایی.

ئەم هەموو توێژینەوە و تاقیکردنەوە زانستیانە ئەوە دەردەخات کە هەرگیز پاڵەپەستۆی دەوروبەر کاری سەرەکی نە لە گیاندار دەکات، نە سیفەت و ڕوخسار و ڕووکار و داهێنراو داگوێزێتەوە لە باوانەوە بۆ وەچە، بەم شێوەیە داروین و داروینیزمەکان کەوتنە گێژاوەوە، دەستیاندایە چەك و پینە، یاساکەیان بە تەواوی گۆڕی و یاسای بازدان (طفرة)یان هێنایە کایەوە.

**بازدان (الطفرات الوراثية):**

**بەهەشت: بازدان چییە و مەبەستی داروینیزمی نوێ لە بازدان چییە؟**

**نەورەسی: بەهەشت گیان، پاش ئەوەی داروینیزم لە مەسەلەی گواستنەوەی سیفەتە داهاتووەکان لە باوانەوە بۆ وەچە لە ژێر تاقیکردنەوەی زانستیدا گیانی دەرچوو، خۆ زایۆنیی جیهانی بڕیاری پشتگیریی داروینیزمی دەرکردووە[٥٠]، هەستان بە بڕیەنگ تێبیەربون و یاساکەیان گۆڕی.**

**داروینیزمی نوێ دەڵێ: لە گیاندارێکدا و لە یەکێك لە جینەکاندا گۆڕانێکی بنەمایی ڕوودەدات، ئەو گۆڕانە دەبێتە هۆی دروستبونی سیفەت و ڕەوشتێکی تازە لەو گیاندارەدا (کە لە پێشدا نەیبووە)، وردە وردە ئەو سیفەتە گەشە دەکات و دەبێتە جیاوازییەك و ئەم جیاوازییە هەر بە هۆی جینە بۆماوەییەکانەوە لە وەچەیەکەوە ئەگوێزرێتەوە بۆ وەچەیەکی تر، داروینیزم دەڵێ: ئێمە هۆی ڕاستەقینەی ئەم بازدانە نازانین، جا ئەگەر ئەم بازدانە ڕاست بێ، دەبێتە هۆیەك لە هۆیەکانی گەشەکردنی گیانداران لە یەکتری و جیابونەوەیان بە هۆی بازدان و گۆڕانی جینەکانەوە تا لە ئەنجامدا بە تەواوی گۆڕاوە و جۆرێکی**

---

[٥٠] بروتوكولات حكماء الصهيون، محمد خليفة التونسي، ص١٨٨.

تایبـەتی (جیـا لـە هـەموو گیانـدارەکانی ئـەو کاتـەی پێشـوو) دروستبووە[٥١].

بەهەشت: ئەی تۆ دەڵیی چی؟

نەورەسی: من دەڵێم چی!! من قسەم نییە، قسە قسەی زانست و زانیارییە.

بەهەشت: ئەی زانست و زاناکان دەڵێن چی؟

نەورەسی: ئەزانی زانست دەڵی چی، جارێ با باسی بازدانت بۆ بکـەم دوایـی دێمـە سـەر ڕاسـتیی و ناڕاسـی داروینیـزم، یەکـەم زانای دۆزەرەوەی بازدان (هۆگۆ فرێز) زانای هۆڵەندی بوو، بەڵام ئەو تاقیکردنەوە و ئەنجامەی ئەو دەستیکەوت، هـەمووی لەسـەر گـژوگیا بـوو، هـیچ هـەنگاوێکی نـەنا بـۆ ئـەنجامی بـازدان لـە گیانەوەراندا، تەنها ئەوەندە هەیە بناغەی مەسەلەکەی دامەزراند و ئەنجامەکەی دایە دەستی زانا بۆماوەییەکانی پاش خۆی.

دیارە پاش مردنـی ئەو (١٩٣٥ز) زانست لە هەموو ڕوویەکەوە هـەنگاوی گـەورە و بـازی پـان و پـۆڕی داوە، زۆر زانـا و زۆر تاقیکردنـەوە پـاش ئـەو سـەریان هەڵـدا، ئـەتوانین کاکڵـەی ئـەو

---

[٥١] (عن الإنسـان والماديـة الداروينية) هـادي المدرسي، ص٤٢. (تطور الجنس البشري)،د. محمد السيد غلاب، ص٢٧. (نظرية التطور وأصل الإنسان) شليمؤ موشي، ص٧٤٠.

تاقیکردنەوانە بەم شێوەیەی خوارەوە کورت بکەینەوە، کاتێ کە بازدان لە گیانداراندا دروست دەبێ دوو جۆرن:

١. بازدانی جینەکان، ئەویش بە تێکچوون و گۆڕینی ڕێکخستن و ڕیزبونی یاسا نایترۆجینییەکانی جینەکە پەیدا دەبێ.

٢. بازدانی کرۆمرسۆمەکان: ئەویش دەبێتە دوو جۆر:

أ/ یان کرۆمۆسۆمێك پەیدا دەبێ لە گیاندارەکەدا.

ب/ یـان ڕێکخسـتن و ڕیزکردنـی کرۆمۆسـۆمەکە ئـەگۆڕێت، کـە لێرەدا چوار جۆرە گۆڕان، یان (بازدان)ڕوودەدات:

١. یان دەبێتە هۆی لەناوچوونی ژمارەیەك لە جینەکان.

٢. یان دەبێتە هۆی دووپاتبونەوەی چەند ژمارەیەك لە جینەکان.

٣. یان دەبێتە هۆی پاش و پێش و جێگۆڕکێی جینەکان.

٤. یان دەبێتە هۆی تێکەڵبونی کرۆمۆسۆمەکان لە ناو خۆیاندا.

ئـەم بازدانانـە کـاتێ دروسـت دەبـێ، ئـەو گیانـدارە بدرێتـە بـەر تیشـکی (X)، چـونکە ئـەم تیشـکە کرۆمۆسـۆمەکە ئەشـکێنێ و پارچە پارچەی دەکات، ئـەم بازدانـە نەبەسـتراوە بـە تەمەنـەوە، هەموو کاتێك و لە هەموو سەراسەری تەمەنی هەر زیندەوەرێکدا (ڕووەك و گیانەوەر) لە ڕێی بازدانی بنەماییدان، جگە لە تیشکی سینی (X) هەندێ داودەرمانی کیمیاگەریش ئەبنە هۆی بازدان، وەك: (ترشەڵۆکی نەترۆز) و زۆرکردنی پلەی گەرمای دەورووبەری گیاندارەکـە، بـۆ نموونـە: ئـەو مێشـە میوەخـۆرەی پێـی دەڵـێن

(درۆسۆفلا) بخرێتە ژێر پلەیەکی گەرمای (٣٠-٣١ پلە) بە هۆی بازدانەوە باڵەکانی بە شێوەیەکی نائاسایی گەشە ئەکەن[٥٢].

بەهەشت گیان، هەر جۆرە گۆڕانێک لەسەر کرۆمۆسۆمەکان رووبدات، ناوێکی زانستییانەی هەیە، بۆ نموونە: ئەگەر بازدانەکە بریتیبێت لە تێکچوونی هەموو کرۆمۆسۆمەکان، واتە: ڕیزکردنەکەیان تێکچووبێ، یان دووپات بووبێتەوە، پێی دەڵێن (پۆلی بلۆیدی) خۆ ئەگەر یەك کرۆمۆسۆم لە ڕیزەکە دەرچووبێ و شوێنەکەی گۆڕابێ، پێی دەڵێن (ئەنیۆبلۆیدی)، ئەو گیاندارەی یەك کرۆمۆسۆم زیاد دەکات، پێی دەڵێن (ترای سۆمی)، واتە یەکێك لە جووتە کرۆمۆسۆمەکە بوو بە (٣) کرۆمۆسۆم، خۆ ئەوەی کرۆمۆسۆمێك کەم بکات پێی دەڵێن (مۆنۆسۆمی) واتە تاك کرۆمۆسۆم، ئەوەی جووتە کرۆمۆسۆمێکی ناتەواوبێ، پێی دەڵێن (نۆلی سۆمی)[٥٣]...هتد.

ئەمە لە ڕووی بازدان بە شێوەیەکی گشتی، بەڵام بازدان کە ببێ بە یاسایەکی بنەمایی و بگوێزرێتەوە لە گیاندارەوە بۆ گیاندار و گەشە بە زیندەوەران بکات، ئەمە لە تەرازووی زانستیدا کێشی نییە، کاتێ دەڵێین تەرازووی زانستی، مەبەستمان تاقیگا و ئەزموونگەیە، نەك تیۆر و (ڕەنگە)، چونکە:

---

[٥٢] (الداروينية، عرض وتحليل)، يحيى محمد، ص١٦٦-١٧٠.

[٥٣] نظرات في علم الوراثة، د. عبدالإله صادق، ص١٩٤-١٩٥.

تاقیکردنەوانە بەم شێوەیەی خوارەوە کورت بکەینەوە، کاتێ کە بازدان لە گیانداراندا دروست دەبێ دوو جۆرن:

١. بازدانی جینەکان، ئەویش بە تێکچوون و گۆڕینی ڕێکخستن و ڕیزبونی یاسا نایترۆجینییەکانی جینەکە پەیدا دەبێ.

٢. بازدانی کرۆمرسۆمەکان: ئەویش دەبێتە دوو جۆر:

أ/ یان کرۆمۆسۆمێك پەیدا دەبێ لە گیاندارەکەدا.

ب/ یـان ڕێکخسـتن و ڕیزکردنـی کرۆمۆسـۆمەکە ئـەگۆڕێت، کـە لێرەدا چوار جۆرە گۆڕان، یان (بازدان)ڕوودەدات:

١. یان دەبێتە هۆی لەناوچوونی ژمارەیەك لە جینەکان.

٢. یان دەبێتە هۆی دووپاتبونەوەی چەند ژمارەیەك لە چینەکان.

٣. یان دەبێتە هۆی پاش و پێش و جێگۆڕکێی چینەکان.

٤. یان دەبێتە هۆی تێکەڵبونی کرۆمۆسۆمەکان لە ناو خۆیاندا.

ئـەم بازدانانـە کـاتێ دروسـت دەبـێ، ئـەو گیانـدارە بدرێتـە بـەر تیشـکی (X)، چـونکە ئـەم تیشـکە کرۆمۆسـۆمەکە ئەشـکێنێ و پارچە پارچەی دەکات، ئەم بازدانـە نەبەسـتراوە بـە تەمەنـەوە، هەموو کاتێك و لە هەموو سەراسەری تەمەنی هەر زیندەوەرێکدا (ڕووەك و گیانەوەر) لە ڕێی بازدانی بنەماییدان، جگە لە تیشکی سینی (X) هەندێ داودەرمانی کیمیاگەریش ئەبنە هۆی بازدان، وەك: (ترشەڵۆکی نەترۆن) و زۆرکردنی پلەی گەرمای دەوروبەری گیاندارەکـە، بـۆ نموونـە: ئـەو مێشـە میوەخـۆرەی پێـی دەڵـێن

(درۆسۆڤلا) بخرێتە ژێر پلەیەکی گەرمای (٣٠-٣١ پلە) بە هۆی بازدانەوە باڵەکانی بە شێوەیەکی نائاسایی گەشە ئەکەن[٥٢].

بەهەشت گیان، هەر جۆرە گۆڕانێك لەسەر کرۆمۆسۆمەکان ڕوویدات، ناوێکی زانستییانەی هەیە، بۆ نموونە: ئەگەر بازدانەکە بریتیبێت لە تێکچوونی هەموو کرۆمۆسۆمەکان، واتە: ڕیزکردنەکەیان تێکچووبێ، یان دووپات بووبێتەوە، پێی دەڵێن (پۆلی بلۆیدی) خۆ ئەگەر یەك کرۆمۆسۆم لە ڕیزەکە دەرچووبێ و شوێنەکەی گۆڕابێ، پێی دەڵێن (ئەنیۆبلۆیدی)، ئەو گیاندارەی یەك کرۆمۆسۆم زیاد دەکات، پێی دەڵێن (ترای سۆمی)، واتە یەکێك لە جووتە کرۆمۆسۆمەکە بوو بە (٣) کرۆمۆسۆم، خۆ ئەوەی کرۆمۆسۆمێك کەم بکات پێی دەڵێن (مۆنۆسۆمی) واتە تاك کرۆمۆسۆم، ئەوەی جووتە کرۆمۆسۆمێکی ناتەواوبێ، پێی دەڵێن (نۆلی سۆمی)[٥٣]...هتد.

ئەمە لە ڕووی بازدان بە شێوەیەکی گشتی، بەڵام بازدان کە ببێ بە یاسایەکی بنەمایی و بگوێزرێتەوە لە گیاندارەوە بۆ گیاندار و گەشە بە زیندەوەران بکات، ئەمە لە تەرازووی زانستیدا کێشی نییە، کاتێ دەڵێین تەرازووی زانستی، مەبەستمان تاقیگا و ئەزموونگەیە، نەك تیۆر و (ڕەنگە)، چونکە:

---

[٥٢] (الداروينية، عرض وتحليل)، يحيى محمد، ص١٦٦-١٧٠.

[٥٣] نظرات في علم الوراثة، د. عبدالإله صادق، ص١٩٤-١٩٥.

١. بـازدان بـه ڕێکـه‌وت دروسـت نـابیٚ، وه‌ك داروینیـزم وا ده‌ڵـێن، به‌ڵکو هۆ و سه‌ره‌تا و ئه‌نجامی دیاریی خۆی هه‌یه و هه‌مووی له توێژینه‌وه‌ی زاناکاندا دیارییه.

٢. بـازدان لــه ڕووه‌کـدا ڕووئـه‌دات بــه‌ره‌و چـاکیی و باشـیی ڕووه‌که‌که، به‌ڵام هـه‌رگیز لـه گیانداراندا بـه‌ره‌و باشـی نـاڕوات و هه‌رگیز بازدان و تێکچوونی کرۆمۆسۆمه‌کان، یان زۆربونی یـه‌ك تاقـه کرۆمۆسـۆم ناگوێزرێتـه‌وه بـۆ وه‌چـه‌ی داهـاتوو، ئـه‌زانی بۆچی؟

چونکه ئه‌و تێکچوونه ده‌بێته هۆی مردنـی گیانداره‌که و کاتیٚ کرۆمۆسۆمێك به زیـاده دروسـت ده‌بـیٚ، ده‌بێتـه هـۆی زۆربـونی خانــه‌کانی لاشــه و گــه‌وره‌بونی لاشــه و دروسـتبونی زللــه‌یی و په‌یدابونی سندان (سرطان) و لوو لـه لاشـه‌ی گیانداره‌که‌دا و لـه دواییــدا مردنـــی، خــۆ ئه‌گــه‌ر بــازدانی بنــه‌مایی و زۆربــون و که‌مبونی چینه‌کان له ڕووه‌کدا که‌ڵکی زۆربونی به‌رهه‌م و چاکی ڕووه‌که‌که ببه‌خشـیٚ، لـه گیانداراندا ڕاسـت نییـه و بریتییـه لـه (قیاسی که‌شك له مه‌شك)[54].

٣. چڕکردن و تێگرتنی تیشکی (X) سینی له هـه‌ر گیاندارێك، ڕاسته ده‌بێتـه هـۆی تێکچوونی کرۆمۆسۆمه‌کان، به‌ڵام ده‌شـبێته

---

[54] (الداروينية، عرض وتحليل)، يحي محمد، ص١٦٩.

هۆی نەخۆشکەوتن و لە ئەنجامدا مردنی، ئیتر بازدانی بنەمایی چی؟

زانای ئەمریکی (مۆرگان) چەند وەچەیەك لە مێشی (درۆسۆڤلا)ی خستە ژێر تاقیکردنەوەی بازدان، ئەویش بە هۆی تاوێك پاڵەپەستۆی گەرمی و تاوێك چڕکردنی تیشك و تاوێك جێگای شێدار و جێگای وشکانی و پێدانی تێکەڵاوی خوێ و داودەرمانی کیمیاویی و تەنانەت تیشکی سینی (X)، کەچی هیچ جۆرە بازدانێکی وەدەست نەهێنا، بەڵام لە ساڵی (١٩٢٧) زانای بەناوبانگ (مۆلەر) توانی بە هۆی تێگرتنی تیشکی (X) بازدان لەو مێشە ناوبراوەدا بێنێتە دی[٥٥]، ئەم تاقیکردنەوە و بازدانەی مۆلەر پاڵی نا بە زاناکانەوە کە زیاتر لە مەسەلەی بازدان بکۆڵنەوە، سەیریان کرد نەك تەنها تیشکی سینی بازدان دروست دەکات، بەڵکو تیشکەکانی (ژووری وەنەوشەیی و ژێر سوور) و گەرما و سەرمای کتوپڕی کاریگەرن بۆ دروستکردنی بازدان، بەڵام هەر هەموو ئەو بازدانەی کە دروست دەبێ بکوژی گیاندارەکانن و ناگوێزرێنەوە بۆ وەچەی نوێ، ئەو بازدانەی کە لە مێشی (درۆسۆڤلا)دا دروست دەبێ، لاشەی مێشەکە لاواز

[٥٥] (کتاب الفلسفة، للصف السابع الثانوي، وزارة التربية القومية والتونسية، الجزء الأول، دار الحرية، بغداد، ١٩٧٧، ص٥٠٠.

دەکـــات و وردە وردە بـــەرەو نـــەمان ئـــەیبات[٥٦]، ئەمـــە بـــۆ گیانـدارەکانی تـر، خـۆ لـە تاقیکردنـەوە و تێبـینی زاناکانـەوە دەردەکەوێت کاتێ مرۆڤ تووشی بازدانی بنەمایی دەبێ، بە هۆی تەقینـەوەی بۆمبایـەکی ئەتۆمییـەوە، یـان بـە هـۆی تێگـرتنی تیشـکی سـینی بـۆ چارەسـەرکردنی نەخۆشـی (هـەر بـە پێـی تاقیکردنەوەی مۆلەر خۆی) ئەو مرۆڤە بنەبڕ دەبێ (ئۆجاغ کوێر) دەبێ، بە تایبەتی ئەگەر ئەو تیشکە کاربکاتە سەر کرۆمۆسۆم و جینەکان[٥٧].

٤. چڕکردنی تیشکی سینی لە دروستکردنی بازداندا کاریگەری زیانبەخشی هەیە و هـەرگیز ناتوانێ گیاندارێکی تازە دروست بکات (پێشکەوتووتر لەم گیاندارەی ئێستا، یان دواکەوتووتر).

٥. نـەگۆڕاون و شـێوەی نـەگۆڕان بنچـینەی ژیـان و ڕواڵـەتی ڕاستەقینەی هـەموو گیاندارەکانـە، کـاتێ بـازدانێکی بنـەمایی لـە تاکێکـدا ڕووئـەدات و پشـتی کـۆم، یـان ملـی خـوار، یـان ناتەواوییەکی لاشەیی ڕووئەدات، ئەمە نابێتـە هۆی دروستبونی وەچەیەکی نوێ.

---

[٥٦] (الداروينية، عرض وتحليل)، يحي محمد، ص١٧٠.

[٥٧] العلم يدعو للإمان، كريسي مۆريسۆن، وەرگێڕانی محمود صالح الفلكي، مكتبة النهضة المصرية، چاپی پێنجەم، ١٩٦٥، ص١٣٨-١٥٠.

٦. بازدان و کاریگەریی لەسەر چینەکان، سنوورێکی دیاریکراوی هەیە به زۆڵەك و ناوێزە (شاذ) دائەنرێت، خۆ ئەگەر لە ڕووەکدا کاریگەربیێ، لە گیانداران (کە دروستبون و پێکهێنانی ئاڵۆزترە) بەو شێوەیە کاریگەر نییە و ئەنجامی خراپە نەبێ چاکەی نییە.

٧. بـازدان و زۆر و کـەمی ژمـارەی کرۆمۆسـۆم هـەرگیز نابێتـە بەڵگەی (گەشـەکردنی گیانداران لـە یـەکتری)، بـۆ نموونـە ئەگـەر بـازدان و زۆربـوونی کرۆمۆسـۆمەکان بەڵگـە بوایـە لەسـەر گەشـەکردن، ئەبوایـە مـرۆڤ (کـە لوتکـەی گەشـەکردنە) لـە هـەموو گیانـدارێك کرۆمۆسـۆمی زیـاتر بوایـە، کەچـی وا نییـە، سـەیر دەکەین ئەسپ (٣٠٠) جووتە کرۆمۆسۆمی هەیە و هەر لە ناودا دەیان گیاندار هەیە پتر لە سەد جووتە کرۆمۆسۆمی هەیە.

٨. دکتۆ عەبدولئیلاه سادق، کە دکتۆرای هەیە لە بایۆلۆجیدا، و لە (مۆسکۆی رۆگە!!) دەرچووە، دەڵـی: "هـەر جۆرە گۆڕانێك لـە کرۆمۆسۆمەکان ڕوودات، لە هەر گیاندارێکدا دەبێتە هۆی منداڵ نەبون و نەزۆکی ئەو گیاندارە، یان نەبونی منداڵێکی باش"[٥٨].

٩. با بەزۆرکردن لە خۆمان ددان بنێین بە بازدانی باش و بڵێین وەچەی نوێ بە هۆی بازدانی بۆماوەییەوە دروست دەبێ، زانای بـایۆلۆجی (بـاتۆ) لـە کتێبی (شـیتەڵی ماتمـاتیکی بـۆ تیـۆری

[٥٨] نظرات في علم الوراثة، د. عبدالإله صادق، ص٢٥.

گەشەکردن)دا دەڵێ[٥٩]: "بۆ ئەوەی سیفەتێکی تازە بتوانێ وەچەیەکی تەواو و جۆرێکی نوێ لە گیانداران داپۆشێ، زیاتر لە یەك ملیۆن وەچە ئەخایەنێ، جا بزانە بۆ ئەوەی سمی ئەسپ لە پێنج پەنجەوە تا دەبێ بەو (سم)ەی کە ئێستا ئەیبینین پێویستی بە چەند کات هەیە؟! هەموو تەمەنی بونەوەر بەشی ناکات، ئەی دەبێ گۆڕانی دەستی ماسی بۆ پەڕەکە چەند وەچە و چەند کاتی بووێ؟ ئەی دەبێ چەند ئەوەندەی هەموو تەمەنی بونەوەرمان بوێ بۆ ئەوەی ئەسپ لە سەگەوە گەشەی کردبێ (وەکو داروینیزم وا ئەزانێ)[٦٠]؟

١٠. دکتۆر (ئەمیل گۆنیۆ) دەڵێ: "لەگەڵ ئەوەشدا کە بازدانی بنەمایی تاقانە ڕێگایە بۆ ڕاڤەکردنی چۆنێتی پەیدابونی جۆرەکانی زیندەوەران، بەڵام تا ئێستا لەسەرچاوەیەکی زانستییەوە نەبیستراوە بە هۆی بازدانەوە گیاندارێك پارچەیەك لە لاشەی زیاد بکات، یان کاربکاتە سەر نەژادی هیچ گیاندارێك"[٦١].

١١. هەموو کاتێك بازدان و تێکچوونی ڕیزی کرۆمۆسۆم مانای نەخۆشی و نائاسایی ئەو گیاندارە دەگەیەنێ، یەکێك لەو

---

[٥٩] (الداروينية، عرض وتحليل)، يحي محمد، ص١٩٧.

[٦٠] (الإسلام يتحدي) وحيد الدين خان، وەرگێڕانی عەبدولسەبور شاهین.

[٦١] بنیاد انواع به زمانی فارسی، ل١٣٥.

نەخۆشییانەی بە هۆی تێکچوونی کرۆمۆسۆمەوە تووشی مرۆڤ دەبێت نەخۆشیی (گێـژێتی، گێلێتی)یـە، ئەمـەش هـەرکاتێك کرۆمۆسـۆمی ژمـارە (٢١) کـە بچـووکترین کرۆمۆسـۆمی ئۆتۆسۆمییە دووپـات بوویـەوە لـە هـەر مرۆڤێکـدا تووشـی نەخۆشـی (گێلـێتی) دەبـێ و پێـی دەڵـێن نەخۆشـی (داوون)، چونکە لە ساڵی (١٨٦٦)دا زانای بۆماوەزانی (لانگرۆن داوون) ئەم نەخۆشییەی دۆزییەوە و بە ناوی ئەوەوە ناونرا.

١٢. هـەروەك لـە پێشـەوە وتمـان لـە ژن و پیـاودا یـەك جووتـە کرۆمۆسـۆمی سێکسـی (جنسـی) هەیـە، وتمـان کـە لـە پیـاودا نیشانەی (XY ) بۆ دادەنرێت و لە ئافرەتدا نیشانە (XX)ی بۆ دادەنرێت، جا کاتی وا هەیە ئافرەتێك تووشی بازدان و گۆڕانی کرۆمۆسۆم دەبیْ، کرۆمۆسۆمە جنسییەکەی نامێنیْ، ئەو کاتە نیشـانەی (XO=XX)ی بـۆ دادەنرێـت، واتـە: کرۆمۆسـۆمە جنسییەکەی نادیارە، ئەم ئافرەتە نەخۆشە و نەزۆکە، سەرەڕای ئەوەی کە هەرگیز منداڵی نابیْ، تووشـی زۆر ڕواڵەتی نەخۆشی دەبـیْ، وەك کـورتی بـاڵای ئافرەتەکـە، پووچـبونی مـەمکی بـە شـێوەیەکی نائاسـایی، ملـی درێـژ، تێکچـوون و ئـاڵۆزانی داوە خوێنینەکانی دڵی، ...هتد

سەرەڕای سووکی ژیریـی و کەم بیر و هۆشـی، خـۆ ئەگـەر پیاو تووشی ئەم نەخۆشییە بون هەروەها پیاوێکی (بیْ تۆو) و کەم

عەقڵ و گێژ و وێڵ دەبێ، بە کورتی بەهەشت گیان هەر جۆرە گۆڕانێـك لـە کرۆمۆسـۆمەکانی مرۆڤـدا ڕوویـدات، هـەرگیز ناگوێزرێتەوە بۆ وەچەی نوێ، چونکە مرۆڤەکە نەزۆك دەبێ و دواجار ئەیکوژێت، بۆ ئەوەی شارەزای هەندێ لەو نەخۆشییانە ببیـت، تەماشـای کتـێبی (نظـرات في علـم الوراثـة، د. عبدالإلـه صـادق، ص١٩٥-٢٠٩) بکـە و بـۆ ئـەوەی بزانـی ئـەو بازدانـە بۆماوەییـە (کـە داروینیـزم دەڵـی ئەگوێزرێتـەوە لـە باوانـەوە بـۆ وەچـە) ناگوێزرێتـەوە و هـەر منـداڵێك لـەدایك بـبێ و ڕیـزی کرۆمۆسۆمەکانی تێك بچێ، یان زیاتر ببێ لە ژمارەی دیاریکراو و نەگۆڕراوی خۆی، ئەو منداڵە لە چەند کاتژمێرێك زیاتر ناژی و ئەمرێت[٦٢]، ئیتر کامەیە بازدانی بۆماوەزانی (الطفـرة الوراثيـة) و دروستبونی گیانداری تازە، فەیلەسوفەکانی داروینیزم!!؟

بەهەشـت گیـان: بـەم شـێوەیە ڕوپووچـی هـەر چـوار پایەکـەی داروینی (کۆن و نوێ)ت بۆ دەرکەوت، بە چاوی خۆت دیت چۆن زانسـت و زانیـاری و تاقیکردنـەوە زانسـتییەکان نـاهێڵێ و ڕێگـەمان نـادات بـاوەڕ بـە داروینـی بهێـنین و بـۆت دەرکـەوت (دەنگی دەهۆڵ لە دوورەوە خۆشە).

---

[٦٢] نظرات في علم الوراثة، د. عبدالإله صادق، ص٢٠٣. (آراء في الحياة والتطور العضوي) عزالدين عبدالحسين، چاپخانەی (الحوادث) بغداد، ١٩٨٠، ص٨٥-٨٩.

## بۆچوونی زانایانی ئیسلام:

بەهەشت: کاکەگیان، هیچت پێماوە لەسەر داروینیزم، ئەگەر پێت نەماوە باسی بۆچوونی زاناکان ئیسلام و ئیسلامناسانم بۆ بکەیت.

نەورەسی: خوشکە خۆشەویستە ژیرەکە، بوخچەکەم زۆری لە بارەی داروینییەوە تێدا ماوە و زۆرم پێیە، بەڵام جارێ با بۆچوونی مامۆستا ئیسلامناسەکان و موسڵمانەکانت لە ڕووی ئایینییەوە بۆ باس بکەم، ئەوجا بۆچوونی زانا ئەکادیمییەکانت لە ڕووی زانستی ڕووتەوە بۆ باس ئەکەم، جا خۆیشم هەندێ قسەت بۆ ئەکەم.

بەهەشت: بە ڕاستی ئەوەم لە بیرم نەبوو، ئەی بۆچوونی زانا ئەکادیمییەکان؟

نەورەسی: بە چاوان بەهەشت گیان، جارێ با بۆچوونی مامۆستایانی ئیسلامت بۆ باس بکەم، ئەوجا دێینە سەر ڕای ئەوانیش.

بەهەشت: باشە فەرموو.

نەورەسی: بەهەشت گیان، گەڕان بە دوای چۆنێتیی پەیدابونی بونەوەر و ژیانیدا ئەرکێکی ئایینییە و فەرمانێکی خواییە، ئایینی پڕ لە شانازیی ئێمە فەرمانی پشکنین و گەڕانمان پێدەکات و هانمان دەدا لەسەر مەسەلەکە، ئەمەش بە دەقی

ئایـەتی پیرۆزی قورئان، کـە ئەفـەرموێ: { قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ } ، ( العنكبوت : ٢٠ )

واتـە: ئـەی موحـەممـەد ﷺ بڵـێ بـە خـەڵکی بـڕۆن و بگـەڕێن بـە زەویـدا و بـزانن چـۆن دروستبون، چـۆن بونـەوەر و ژیـان پەیـدا بووە و دەستی پێکردووە. بە پێی ئەم فەرمانـە خواییـە گـەڕان و لێکۆڵینـەوە و توێژینـەوەی چـۆنێتی پەیـدابونی ژیـان و مـرۆڤ، ئەرکی سەرشانی ئێمەی موسڵمانـە، زیاتر لە هەر کەسێکی تر، ئەبوایـە پـێش بـەڕێکردنی (کەشـتی بیگـل) ئێمـە ئـەو گەشـتە و هـەزاران گەشـتی بیرەوەریـی و زانسـتی، لـەو شـێوە و قوڵترمـان بکردایـە، بـەڵام دوژمنـانی ئیسـلام نـاهێڵن پشـوویەك بـدەین و زاناکانمـان چـاوێك بکەنـەوە، هەرچـەندە زانـا موسـڵمانەکان ئـەم ئەرکەیان تا ڕادەیەك نەخستۆتە پشتگوێ و چاوی توێژینـەوە و چەندو چونیان لـێ وردکردووەتـەوە و ڕا ڕا لێـی وەستاونەتەوە، وا لە خوارەوە زۆر بە کورتی بۆچوونی زاناکانمان باس دەکەین:

جـا پـێش ئـەوەی بۆچـوونی زاناکـانی (هاوچـەرخ)ی ئیسـلام بەرامبەر بە داروینیزم باس بکـەین، پێویستـە چـەند خاڵێك باس بکەین:

١. بەهەشت گیان، لە بیرتە لە سەرەتای ئەم وتوێژەوە پێم وتیت کە (نە داروین و نە لامارك و نە بۆفۆن) و نـە کـەس خـاوەنی ئـەم

تیـۆری گەشـەکردنە نییـە، زانایـانی خۆمـان نـەبێ و زانایـانی ئیسلام بە سەدان ساڵ پێش لەدایکبونی داروین و لامارك و مەندڵ و هەموو زانایانی ئەورووپی و زاناکانی زیندەوەرزانی و ڕۆژئاوایی ئەو تیۆرەیان چاکتر لە داروین باس کردووە.

٢. خۆ ئەگەر زۆریش لە خۆمان بکەین و حەز بکەین لەوەی تیۆری پەیدابون و گەشەکردن ڕاست بێ ملی زانستی بۆ شۆڕ بکەینەوە و بیسەپێنین بەسەر زانستدا هیچ پێویستمان بە لامارك و داروین و داروینیزمی تازە نییە.

ئەوەی سەیرێکی وتەکانی مامۆستایان (ابن مسکویە، ابن خلدون، مەلا صدرالدینی شیرازی، ئیبن توفەیل و ئیخوان ئەلصەفا، ...هتد) بکات، سەری سوڕئەمێنێ و ئەگەر هەرکەسە دڵ کوێر نەبێ و چاوی دڵی کوێر نەبێ ئەزانێ داروین و هەموو ئەورووپا پاشخوان خۆری موسڵمان و زانایانی موسڵمانن، بەهەشت گیان ئاخ بۆ ئەو موسڵمانەی خۆی بناسێت بۆیە حەز ئەکەم گوڵچنێکی بۆچوونەکانی ئەوان بکەین و دواجار خۆت بەراوردێك بکە لە نێوان وتەکانی ئەوان و مامۆستا لاوەکانی ئێستامان، بزانە چۆن بە سەدان ساڵ پێش ئەوان کەوتوون، بەڵام ئەو مامۆستایانەی ئێمە یەك نەنگی سەرەکییان هەیە، ئەویش ئەوەیە جاشی زایۆنیزمی جیهانی نەبون، بۆیە زوڕنای پڕوپاگەندە و ڕاگەیاندنی جیهانی لە ئاستیان خامۆشە.

أ/ ئەبو عەلی ئیبن مەسکویە و خازن، کە لە ساڵی (٩٤٠ن) لە دایك بووە و ساڵی (١٠٢١ن) کۆچی دوایی کردووە، دەڵی: "ژیان یەك زنجیرەی نەبڕاوەیە، هەموو جۆرە زیندەوەر (گیاندار و ڕووەك)ێك بە شێوەیەکی سادە دێتە ژیان، جا دوایی وردە وردە گەشەدەکات و ئاڵۆز دەبێ، هەتا ئەگاتە ئاسۆ و لێواری ئەو جۆرە زیندەوەرەکەی تر کە لەو پێشکەوتووتر و گەشەدارترە، ڕووەك لە سەرەتاوە وەك بێگیان وایە، زۆر کەم جیاوازییان هەیە، جا وردە وردە گەشە دەکات و گەشە دەکات، هەتا ئەگاتە پلەیەکی نزیك و دراوسێی گیانداران، ئەمجا دەبێتە گیاندار، هەروا گیانداران لە پلەی نزیکی ڕووەکەوە دەستپێدەکات تا ئەگاتە نزیکی ئادەمیزادان"، ئیبن عەلی مەسکویە لای وایە: "مرۆڤ هەر بەردەوامە لە گەشەکردن و گەشەکردن لە ئادەمیزاددا ناوەستێ"[٦٣]، هەتا لە بارەی نزیکی مەیمونەوە لە مرۆڤ دەڵی: "پلەی مەیمون و هاوچەشنانی لەو گیاندارانەن نزیکن لە مرۆڤەوە"[٦٤]، ئەم گیاندارانە لە هەموو ڕوویەکەوە زۆر نزیکن لە

---

[٦٣] (قصة الإيمان، بين الفلسفة والعلم والقرآن) الشيخ نديم الجسر، چاپی سێیەم، ١٩٦٩، منشورات الكتب الاسلامي، بيروت، ص٦٤.

[٦٤] موسوعة العقاد، جزء الرابع، القرآن والانسان، عباس محمود العقاد، دار الكتب العربي، بيروت، ١٩٧١، ص٣٠٢.

مرۆڤ و پلەی زۆر کەمی ماوە بۆ مرۆڤایەتی ئەگەر بازبدا و ئەو پلەیە ببڕێت، دەبێتە مرۆڤ"[٦٥].

**بەهەشت:** جا کاکەگیان، ئیتر چی تازە ماوەتەوە بۆ داروین و ئەوروپییەکان بیکەن بە هی خۆیان و خۆیانی پێهەڵکێشن بەسەر ئێمەدا، کە داروین ساڵی (١٨٠٩ز) لە دایك بووە و ئیبن مەسکویە ساڵی (١٠٢١ز) کۆچی دوایی کردووە، واتە: (٧٨٨) ساڵ پێش لەدایکبونی داروین ئەو گیانی بەڕێزی بە بەهەشت شاد بووە.

**ئەوروەسی:** ئەی بۆچی دەڵێم ئاخ بۆ ئەو موسڵمانەی نرخی خۆی وەك موسڵمانێك و خاوەنی ئەم کەلەپوورە و مێژووە زێڕینەی خۆیە (ئەو قورئانە مامۆستایەی) بزانێت.

ب/ مامۆستای کۆمەڵناسی موسڵمان (عەبدوڕڕەحمان ئیبن خەلدون، کە ساڵی (٨٠٨ك – ١٤٠٦ز) کۆچی دوایی کردووە، ئەفەرمووێ: "سەیرێکی ئەم جیهان و بونەوەرە بکە و بزانە چۆن بە شێوەیەکی ڕێکوپێك ڕیزکراون لە کانزاکان و ڕووەك و

---

[٦٥] سلسلة الموسوعة الصغيرة (٤١) مساهمة العرب في علوم الحياة، عادل محمد علي الشيخ حسين، دار الحرية للطباعة بغداد، حزيران ١٩٧٩، ص٦٩. هەروەها (تهافت الفلسفة) محمود ابوالفيضى المنوفي، دار الكتب العرب، بيروت، چاپی یەکەم، ١٩٦٧، ص٢٦١.

گیانـدارەکان، چـۆن هـەر کۆمـەڵێکیان بەسـتراوە بـە کۆمـەڵێکی ترەوە.

دوا پلـەی کانـەکان بەسـتراوە بـە سـەرەتای ڕووەکـەوە. ڕووەك بـە سەرەتای گیاندارەوە، ئەم بەستنە مانای ئەوە ئەبەخشێت کە دوا پلەی کۆمەڵەی یەکەم ئەتوانێ ببێتە یەکەم پلەی کۆمەڵەی دووەم و هـەروەها" بەهەشـت گیـان. گـوێ بگـرە چـی دەڵـێ: "خـۆ گیاندارەکانیش جیهانەکەیان فراوان بوو. جۆر جۆر بون هەتا دوا پلەیان بووە بە مرۆڤ، ئەو مرۆڤە خاوەن بیر و هۆشە"[٦٦].

**بەهەشت:** هەتا دوا پلەیان بووە بە مرۆڤ؟

**ئەورەسـی:** بەڵێ بەهەشت گیان، هەتا دوا پلەیان بووە بە مرۆڤ. بەهەشـت گیـان لـە بیرتـە یـەکێ لـە پایـەکانی داروین (زۆرانبازی گیانداران بوو لەسەر ژیان؟).

**بەهەشت:** ئەی چۆن لە یادم نییە؟

**ئەورەسی:** جا گوێبگرە لە فەیلەسوفی ئیسلام (ئیبن سینا) بزانە چی دەڵی:

ج/ ئـەبو عـەلی ئیبن سـینا، کـە سـاڵی (٩٨٠ز) لـە دایـك بـووە و ساڵی (١٠٣٧ز) کۆچی دوایی کردووە، دەڵی: "هەموو شتێك لەم

---

[٦٦] (مقدمة ابن خلدون)، عبدالرحمن محمد خلدون، ئیبن خەلدون، چاپخانەی مسـتەفا موحەممـەد، میسـر، ص٩٦. (أصـل الأنـواع) داروین. ص١٣، پێشەکییەکەی.

بونەوەرەدا ناتەواوە و هەر هەموویان هەوڵدەدەن خۆیان تەواو بکەن و بگەنە ئامانج و جوانی، هەموو گیاندارانی جیهانی پاڵ پێوەنراوە بۆ گەیشتن بەو ئامانج و جوانییە، ئەو جوانییەی کە لای خوایە، جا لەم ڕێگا بڕینە بۆ تەواویی و پڕکردنەوەی ناتەواوییە، گیاندارەکان ئەکەونە جەنگەوە هەتا ئەگەنە پلەیەکی چاکتری ژیان، هەر ئەم جەنگ و زۆرانبازییە، مرۆڤ لەم پلەی ئێستادا ناهێڵێت و ئەیگەیەنێتە پلەیەك کە ئێمە لەم کاتەدا ناتوانین بزانین چۆن دەبێ"[٦٧] .

بەهەشت: کاکەگیان بڵێی (ئیبن سینا) مەبەستی لە شارستانییەتی سەدەی بیست بووبێ ؟

نەورەسی: خوشکێ گیان، (إتَّقوا فِراسَةَ المُؤمِن) هیچ دوور نییە.

د/ بەهەشت گیان، ئەگەر وتەکانی هەموو زاناکانی ئیسلام لە بارەی تیۆری پەیدابون و گەشەکردنەوە و پێشکەوتنیان لەسەر داروین و هەموو داروینبازەکان بنووسین، پێویستمان بە کاتێکی زۆرە و دواجار نوسینێکی زۆر هەیە[٦٨]، بەڵام کۆتایی ئەم

---

[٦٧] مجلة البلاغ العراقية، العدد ٦، السنة الخامسة، بغداد ١٩٧٥ مقالة الشيخ محمد حسن آل ياسين (هل كان داروين أول قائل بالتطور)؟.

[٦٨] (موسوعة العقاد الاسلامية) بەرگی چوارەم، ل٣٠١، وتەکەی (محمد الكتبي الداراني) کە دەڵێ: "مەیمون گیاندارێکە لە مرۆڤ و ئاژەڵ دروست بووە، وردە وردە گەشەی کردووە لە سروشتدا و بەرەو مرۆڤی".

پێشکەوتنەمان لەسەر ئەورووپاییەکان بە سەردانێك لە نوسینەکانی کۆمەڵی (اخوان الصفا) کۆتایی پێئەهێنین.

**بەهەشت:** (اخوان الصفا) کێن و چیان وتووە؟

**ئەورەسی:** ئەوەیش زۆری ئەوێ (کێن و چییان وتووە)، بەم سەرپێیییەوە وەڵام نادرێتەوە، بەڵام (اخوان الصفا) کۆمەڵێکی سیاسیی ئیسلامی بون، بنکەیان لە شاری (بەسرە)ی عێراق بوو، ئامانجیان بەستنی پەیوەندی بوو لە نێوان ئاییني ئیسلام و زانست و فەلسەفەدا، بیروڕاکانیان بە شێوەی نامیلکە و لە (٥٢) نامیلکەدا بڵاوکردەوە، تا ساڵی(٩٨٣ز) مانەوە[٦٩]، ئەم کۆمەڵە لە هەموو ڕوویەکی زانستەوە دواون و نوسیویانە، ئەم کۆمەڵە زۆر لە سەدەی خۆیان پێشکەوتووتر بون، ئەگەر بە وردی سەیری نووسراوەکانیان بکەیت، ڕەنگە بڕوا نەکەیت (٩٠٠) ساڵ لە پێش لە دایکبونی داروینەوە کەس توانیبێتی (پەیدابون و گەشەکردن) جوانتر لە داروین و بەو شێوەیە شیتەڵ کردبێ، (اخوان الصفا) لە نامیلکەی ژمارە (٢)ی خۆیاندا دەڵێن: "خوای گەورە کاتێ بونەوەر و شتەکانی بونەوەری دروستکرد، بنەڕەتی هەموو شتەکانی ئەم بونەوەرەی لە یەك ولوولە (هیولی) دروستکرد، تەنها لە شێوە و چۆنێتی و چەندێتی لە یەکتری

---

[٦٩] (اخواهن الصفا و خلان الوفا) د. مصطفى غالب، دار مكتبة هلال، بيروت، چاپی یەکەم، ١٩٧٩.

جیایکردنەوە، سەرەتای هەر شتێکی بەرزی بەستووە بەو شتەی لەو پەستتر و خوارترە"، هەروەها دەڵێن: "سەرەتای ڕووەکی بەستووە بە کانەکانەوە و سەرەتای گیاندارانی بەستووە بە ڕووەکەوە و گیاندارانی تر بە مرۆڤەوە، چونکە هەندێ لە کانەکان وەك ڕووەك گەشە ئەکەن[٧٠]، هەندێ ڕووەك وەك گیاندار خاوەن هەستە و هەندێ لە گیانداران زۆر نزیکە لە ئادەمیزادەوە وەك مەیمون".

(اخوان الصفا) لەسەر تیۆری گەشەکردنی ڕووەك وگیانداران ئەڕۆن و بە دەیان نموونە ئەهێننەوە[٧١].

بەهەشت گیان بەم جۆرە بۆت دەرکەوت کە ئەوروپا و مامۆستاکانیان کاسەلێسی ئێمەن، ئێمە کاتی موسڵمانێتیمان

---

[٧٠] لە ناوچەی هەورامانی تەخت لە کوردستانی ئێران و لە پاڵی گۆڕی (پیرشالیار)دا دوو بەرد هەن، زۆر سەیرن، ئەو دوو بەردە هەموو ساڵێك لە ڕۆژێکی تایبەتیدا کە دانیشتووانی ناوچەکە پێی دەڵێن (ڕۆژی کۆمسای) ئەو دوو بەردە ئەشکێنن، نزیکەی هەندێك بەشکاندنی ئەیبەن بە ناخی زەویدا، کەچی بۆ ساڵی داهاتوو هەمان ئەو دوو بەردە دەڕوێنەوە، ئەو بەردانە لە ڕۆژی (کۆمسای)دا نەبێ بە ئەستەم ئەشکێت، کەچی ئەو ڕۆژە بە ئاسانی بۆ هەموو کەس ئەشکێت.

[٧١] (الإنسان بين الخلق والتطور) محمد حسين آل ياسين، بەرگی یەك، ص٣٢-٣٤.

(نـەك ئێمـەی ئـەمڕۆ) بۆیـە دەڵـیم ئێمـە هـیچ پێویـستییەکمان بـە تیۆری بیرتیژانی (!!) ئەوروپا نییە.

**بەهەشت:** ئەی کەئەمە ڕای زاناکانی ئەو کاتەی خۆمانە، گوایە هەموو زاناکانی ئێستامان لەسەر ئەو ڕایەن و خۆ ئەگەر لەسەر ئەو بۆچوونەن، ئیتر ئەو هەموو سەروگوێلاك کوتانە و شەن و کەوە چیی بوو کردت؟

**نەورەسی:** بەهەشت گیان، هەتا داروینی تیۆری پەیدابون و گەشەکردن نەکردرابوو، نەکرابووە داردەست بۆ قەلاچۆکردنی ڕەوشت و مرۆڤایەتی تیۆری خۆمان بوو، بەڵام ئێستا نەخێر بۆچوونی زاناکانی ئێستامان وا نییە.

**بەهەشت:** ئەی چۆنە؟

**نەورەسی:** نووسەران و زانایانی ئیسلامی ئەم سەدەی دواییە خاوەنی دوو بۆچوونن، یان باشتر بڵێین خاوەنی دوو قوتابخانەی جیاوازن لە یەکتری و هەر یەکەیان چەند زانای ئیسلام و کەڵە نووسەری بەرزی تێدا هەڵکەوتووە، وەك لەمەودوا بۆتی باس دەکەم.

## قوتابخانەی جەمالەدینی ئەفغانی:

**ئەورەسی:** تیۆری پەیدابون و گەشەکردن، پێش هاتنی داروین، یان ڕاستتر بڵێین پێش ئەوەی ببێتە چەکی دەستی زایۆنی و بێڕەوشتەکان، ئەو سەنگەی ئێستای نەبوو، لەبەرئەوە هەر زانایەك باسی کردبێ و چۆنی وتبێ و چی وتبێ نەبۆتە هۆی سوربونەوە و توڕەبونی زانایەکی تری بەرامبەری، کاتێ زایۆنی (داروین)یان بەسەروبەرەوە کرد، لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە داگیرکەرانی ئەوروپایی ڕوویان کردە وڵاتە ئیسلامییەکان، داگیرکردنی سوپایی، داگیرکردنی ئابوری، داگیرکردنی بیرەوەری و... هتد، لە بەرامبەر ئەم داگیرکردن و لێشاوە، هەموو گەلانی موسڵمان شڵەژابون و واقیان وڕمابوو، زۆربەی زۆری ڕۆشنبیران (منوران)ی وڵاتەکانمان لە ڕیزی پێشەوەی پێشوازیکەرانی ئەو داگیرکەرانەوە بون[72]. بەشی زۆری مامۆستا ئاینییەکانیش کونجی مزگەوتی خۆیان لێگرتبوو، هەر ڕۆژێ دەرزەنێ فتوای کوفریان بەرامبەر بەم و بەو دەرئەکرد و هیچی تر، بەڵام خوا (کەفیل) و ئۆباڵداری ئەم ئاینیەیە و هەموو کاتێك بە شێوەیەك کە ئێمەیش بە تەواوی ئەقڵمان پێی ناشکێت، پارێزگاری

---

[72] (اجنحة المكر الثلاثة وخوافيها) من السلسلة اعداء الأسلام ٣، د. عبدالرحمن الميداني، دار القلم، دیمشق، الطبعة الثانية، ١٩٨٠، ص١٩-٢٠.

دەکات، ئا لەم کاتەدا خوا هەندێ زانای هێنایە سەر شانۆی تێکۆشان کە توانییان دەستێك بەسەر چاوی لاوەکاندا بهێنن و بەو خەڵکە رابگەیەنن کە ئەوروپا داگیرکەر و خوێنمژی ئێمەن، نەك دڵسۆز، ئەوانیش: جەمالەدینی ئەفغانی و شاگردەکانی بون.

لەگەڵ ئەوەدا کە من زۆر لە لێکۆڵینەوەی زانستییان (تەفسیری قورئان و ملکەچکردنی قورئان بۆ هەموو تیۆرێك مۆری زانستی لێدرابێت) وەڕسم، بەڵام بە ڕاستی ئەو مامۆستایانە لە کاتێکی زۆر ترسناك و لە ناو گەلێکی دوور لە خوایی دەژیان و دوژمنانی خوا زۆر بێئابڕو بون و موسڵمانان زۆر پرش و بڵاو بون (خوا لەسەر نیازی دڵیان پاداشتیان بداتەوە) جەمالەدینی ئەفغانی بووە سەردەستەی قوتابخانەیەکی ئیسلامی کە سەرانسەری جیهانی ئیسلامیی گرتەوە، لە میسر موحەممەد عەبدە و موحەممەد ڕەشید ڕەزا و موحەممەد فەرید وجدی و عەباس مەحمود عەققاد و ..هتد

ئەتوانین بڵێین موحەممەد ئیقباڵ لە هیندستان و موحەممەد عەلی جەناح لە پاکستان و د. عەلی شەریعەتی لە ئێران و مەلای گەورە و حاجی قادری کۆیی لە هەولێر و شێخ موحەممەدی خاڵ لە سلێمانی و ئایەتوڵلا مەردۆخی لە سنە و هەزارانی تر قوتابی ئەم قوتابخانە بون.

جا ئەم مامۆستا و ڕۆشنبیرە ئیسلامییانە هەوڵێکی بێپایانیان داوە بۆ بەستنی برایەتی، یان یەکێتیی نێوان ئایین و زانست، تەنانەت قورئان و هەر تیۆرێك و وتەی هەر کەسێك مۆری زانستی (ئەگەر چی بە درۆیش مۆری لە خۆی دابێ) کە بۆ ئەو کات کەلێنێکی گەورەی بانگەوازی ئیسلامییان پڕ کردبووەوە.

جا ئەم قوتابخانەیە ئەگەرچی هەندێ جار دژایەتی پیشان ئەدەن، بەڵام بە پێی باری ئاڵۆزی ئەو کاتە هەوڵیانداوە کە برایەتیی لە نێوان ئیسلام (قورئان) و تیۆری داروینی ببەستن، لایان وابووە کە ئەگەر زانستی ڕاستەقینەش پشتگیریی داروینی بکات، هیچ دژایەتییەك لە نێوان زانستی و قورئاندا ڕوونادات، وا لە خوارەوە نموونەی بۆچوونی ئەم قوتابخانە بە گشتی ئەخەینە پێش چاو:

١. هەندێ لەم کۆمەڵە نووسەرانە لایان وایە (ئادەم) واتە ئەو ئادەمەی پێغەمبەرەی کە باوکی مرۆڤایەتییە، یەکەم کەس نییە و پێش ئەو ئادەمە هەزاران مرۆڤ و ئادەمی تر بون، بەڵگەشیان:

ا/ خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە سورەتی (البقرە) و لە ئایەتی ژمارە (٣٠)دا کە باسی پێشەکییەکانی دروستکردنی ئادەم دەکات، ئەفەرمووێ: {وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ

بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّيَ أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ } ، واتــــــه: کاتێـــــك پــه‌روه‌ردگاری تــۆ بــه فریشــته‌کانی فــه‌رمووی: مــن ئه‌مــه‌وێ جێنشــینێك له‌ســه‌ر زه‌وی دروســت بکــه‌م و جێنشــینێك دابنــێم، فریشته‌کان وتیـان: ئایـا تـۆ ئـه‌و زه‌وییـه ئاوه‌دان ده‌که‌یتـه‌وه بـه جۆره که‌سانێ که پشێوی ئه‌نێنه‌وه و چه‌په‌ڵی ئه‌که‌ن و خوێنی تێدا ئه‌ڕژێنێ، ئه‌ی بۆچی به ئێمه ئاوه‌دانی ناکه‌یته‌وه، له کاتێدا ئێمه پاکیت بۆ بڕیار ده‌ده‌ین و سه‌رپێچی فه‌رمانه‌کانت ناکه‌ین، خوا فه‌رمووی: ئه‌وه‌ی من ئه‌یزانم ئێوه نایزانن.

نووسه‌رانی ئه‌م قوتابخانه‌یه ده‌ڵێن: ئه‌گه‌ر کۆمه‌ڵ، یان کۆمه‌ڵانی مرۆڤی تر له پێش ئه‌و ئاده‌مه‌وه نه‌بون، فریشته‌کان خۆ غه‌یبزان نین، چۆنیان زانی ئه‌م مرۆڤه‌ی که هێشتا په‌یدا نه‌بووه و پێی نه‌خستۆته ڕووی زه‌وی، خوێنڕێژ ده‌بێ و له فه‌رمانه‌کانی خوا ده‌رده‌چێت و پشێوی و ئاشوبه له‌سه‌ر زه‌ویدا بڵاوده‌کاته‌وه؟ ده‌ڵێن: دیاره لـه پـێش ئـه‌م ئـاده‌می خه‌لیفه‌ی خوایه، مـرۆڤ و ئـاده‌می تـر زۆر بـووه، بـه‌م کـاره ناشـیرینانه هه‌ستاون، بۆیـه فریشته‌کان زانیویانه[٧٣].

---

[٧٣] (ته‌فسیری المنارة) محمد رشید رضا، دار المعرفة، بیروت، چاپی دووه‌م، ص٢٨٥، به‌رگی یه‌که‌م، ڕایه‌که‌ی پێشه‌وا محمد عبده.

ب/ ئیمام عەلیی کوڕی حسین( زەینول عابدین ) (ڕەزای خوایان لێبێت) فەرمووی بە ئەبو حەمزەی سمالی: ئایا وا ئەزانن خوا لە پێش ئێوەدا کەسی دروست نەکردووە ؟

بەڵێ، سوێند بە خوا لە پێش ئێوەوە خوای گەورە هەزار هەزار ئادەم و هەزار جیهانی دروستکردووە، دیسان سوێندبێ بە خوا تۆی ئادەمیزادی ئێستا لە دوای ئەو هەموو جیهان و ئادەمانەوە هاتوویت[٧٤].

ج/ پرسیاریان کرد لە پێشەوا عەلیی کوڕی ئەبیتالب (ڕەزای خوای لێبێت) کە ئایا لە پێش ئادەم پێغەمبەرەوە کەس بووە خواپەرستی بکات ؟

فەرمووی: بەڵێ، لە هەموو زەمین و ئاسمانەکاندا خواپەرست هەبووە، کاتێ خوا زەوییەکانی دروستکرد، فریشتەی گیانی (روح) دروستکرد، لە پاش فریشتە، جنۆکەی دروستکرد، لە پاش جنۆکە خوا جۆرە گیاندارێکی تری دروستکرد کە خاوەنی گیان و لاشە بون و خواردن و خواردنەوەی وەك (نەسناس[٧٥]،

---

[٧٤] بحار الأنوار. مجلسي، تاران، ١٣٧٦ هەتاوی. بەرگی ٥٧، ل٣٣٦.

[٧٥] لە راستیدا (نەسناس) جۆرێکە لە مەیمون هەرچەندە هەندێ لایان وایە نەسناس گیاندارێکی ئەفسانەییە، فرهنگ عمید حسن عمید، چاپی دوانزەیەم، انتشارات امیر کبیر. ل١٠٣٢، بەڵام سەرێکی (المنجد في اللغة والأعلام، چاپی بیست و یەکەمی ساڵی ١٩٧٣، ل٨٠٣، ستونی دووەم بکە.

مەیمون) کە وەك مرۆڤ وابون، بەڵام مرۆڤ نەبون، لە ناوەڕاستی زەویدا داینان، لە دوای ئەمانیش گیاندارێکی نزیك لە مرۆڤی دروستکرد، کە گێژ و وێژ و بێوێڵ بون، لە لەوەڕگاکان وەك ئاژەڵ ئەلەوەڕان، نەوەك ئاژەڵ و نە وەك جڕوجانەوەر وابون، ئەمجا خوا ئادەمی دروستکرد[٧٦].

٢. مامۆستایانی ئەم قوتابخانەیە دەڵێن: "هیچ کاتێك ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ئەوە ناگەیەنێ کە یەکسەر ئادەم لە گڵ و قوڕ دروستبووبێت، ئەوەی کە خوا ئەفەرمووێ: { وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ } (المؤمنون : ١٢)

یان ئەوە کە پێغەمبەری مەزنمان ﷺ ئەفەرمووێ: (کُلکُم مـن آدم، وآدمُ من تُراب)، یان هەر ئایەت و فەرموودەیەکی تری پێغەمبەرمان ﷺ مانای دروستکردنی ئادەم و ئادەمیزادان لە گڵ و قوڕ بگەیەنێ، ئەمانە هیچیان ئەوە ناگەیەنن (ئادەم یەکسەر لە گڵ دروستبووبێت)[٧٧]، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە ڕەگەزپەرستی نەمێنێ، هیچ نەتەوەیەك لە هیچ نەتەوەیەکی تر خۆی بە زیاتر نەزانێ و هەموو نەتەوەیەك و مرۆڤێك ماف ژیانی

---

[٧٦] الأنسان بين الخلق والتطور، بەرگی دووەم، ص٤٩.

[٧٧] (حوار مع صديقي الملحد)، د. مصطفى محمود، مطابع مؤسسة روز اليوسف، چاپی یەکەم، ١٩٧٤، ص٩٦.

هەبێ، ئەوە نییە قورئانی پیرۆز کاتێ باسی دروستبونی عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) دەکات، ئەفەرمووێ:

{ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ }

( آل عمران : ٥٩ )

واتــە: وێنــەی دروســتبونی عیســا لــە لای خــوا وەك چــۆنێتی دروستبونی ئادەم وابوو، خوا لە گڵ دروستیکرد، ئایا یەکسەر عیسا لە گڵ دروستبوو؟

دیـارە نـەخێر، بـەڵکو لـە زنجیرەی هـەزاران و ملیۆنـەها ئـادەم و ئادەمیزادان، هەتا گڵ و قوڕ، دروستبووە.

٣. مامۆســتا و زانایــانی ئــەم قوتابخانەیــە دەڵــێن: "وشــەی گەشــەکردن لــە قورئــانی پــیرۆزدا بــە ڕوونــی و زەقــی هــاتووە و پێویســت ناکــات خۆمــانی لــێ وێــڵ بکــەین، ئــەوە نییــە قورئــان ئەفەرمووێ: { وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا }، ( نوح : ١٤ )

واتە: بە ڕاستی خوا ئێوەی بە قۆناغ قۆناغ و جۆر بە جۆر لە گەشەکردنێکەوە بۆ گەشەکردنێکی تر دروستکردووە"[٧٨].

٤. لای ئەم نووسەرانە ئەگەر تیۆری پەیدابون و گەشەکردن بە شێوەی داروینیزمی نوێ بێ، زانست پشتیوانی بکات، ئەو ئادەمە پێغەمبەرەی ناوی لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە یەکەم مرۆڤ

[٧٨] الداروينية عرض وتحليل، يحيى محمد، ص٢٠٨.

نەبێ و هەزاران جۆرە مرۆڤی مەیمونی و نیاندەرتاڵ و جاوە و پەکین و ...هتد

پێش ئادەم بووبێ، تەنانەت ئەگەر گەڕانەوەی هەموو زیندەوەران بۆ تاقە خانەیەکی زیندووی سەرەتایی پێش پەیدابونی هەموو ڕووەك و گیانداریك ڕاستیش بێ، هیچ نابێتە هۆی پەنا بە خوا لەقبونی جێگای تاقانە ئایەتێك لە قورئانی پیرۆز.

٥. ئـەم مامۆستایانە لایـان وایـە مەبەسـتی خـوای گـەورە لـەو ئایەتـەی کـە ئەفـەرمووێ: { وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم } ، ( الأنعام : ٣٨ )

واتـە: ئـەی مـرۆڤ و ئـادەمیزادان هـەموو گیانلەبـەرێك کـە بەسـەر زەویـدا ئـەڕوات و هـەموو باڵندەیـەك کـە باڵـەکانی بـە (حـەوادا) دەفڕێت، ئوممەت و نـەژاد و دروستکراوێکی وەك ئێـوەن[٧٩]، یـان لە سورەتی نوحدا دەفەرمووێ: ( وَاللَّهُ أَنبَتَكُم مِّنَ الْأَرْضِ نَبَاتاً) واتە: خوا (ئێوەی مرۆڤی) بە ڕوواندن( هـەروەك ڕووەك) ئێوەی ڕوواندووە.

لە ئایەتی یەکەمدا خوا بە لاتیر پەنجەمان بۆ (تیۆری گەشەکردن) ڕائەکێشێت و لـە ئایەتی دووەمدا بە شێوەیەکی لاوەکی پێمان

---

[٧٩] گۆڤاری (التربیـة الأسـلامیة)ی عێـراق، ژمـارە ٤، سـاڵی (٢٣)، ١٩٨٠/٩/١٠، وتارەکەی مامۆستا مەحمود غەریب، ص٢٣٢.

رادەگەیـەنێت کـە شـێوەی دروسـتبونی مـرۆڤ وەك شـێوەی دروستبونی ڕووەك وابووە[80].

٦. بەڵکو هەندێ لەو مامۆستای قوتابخانەیە بۆ بەراوردکردن و چەسپادنی هەر بەند و پایەیەك لە پایەکانی تیۆری داروینی لەگەڵ قورئاندا، بۆ هەر یاسایەکی داروینی ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزیان لە بەرامبەری داناوە، بۆ نمونە: مامۆستا موحەممەد فەرید وجدی بۆ ڕێسای (زۆرانبازی گیانداران بۆ مانەوە)ەکەی داروینی دەڵی[81]: ئەوەتا خوایش لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرمووێ: {وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ}، (البقرة : ٢٥١)

واتە: ئەگەر زۆرانبازی و لێکەوتن و جەنگی نێوان مرۆڤەکان نەبوایە (ژیان و یاسا) لە زەویدا تێك دەچوو، بۆ یاسای (مانەوە بۆ شیاوترە بۆ مانەوە) خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرمووێ: {وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِى ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعْدِ ٱلذِّكْرِ أَنَّ ٱلْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِىَ ٱلصَّٰلِحُونَ}، (الأنبياء : ١٠٥)

---

[80] القرآن محاولة لفهم عصري، د. مصطفى محمود، ص٥٤.

[81] (الأسلام في عصر العلم، محمد فريد وجدي، چاپی سێیەم، دار الكتاب العربي، بيروت، ١٩٦٧، ص٨٠٢-٨٠٣.

واتــە: بــە ڕاســتی ئێمــە لــە هــەموو کتێبــە نێرراوەکانمــان بــۆ مرۆڤایــەتی، لــە سەرچــاوەکانی نێرراوەکانــدا نووســیومانە کــە ژیانی سەر زەوی و جڵەوی سەر زەوی بە میراتی ئەمێنێتەوە بۆ ئەو بەندانەم کە چاك و لەبارن.

ئەمەبوو بە کورتی بۆچوونی قوتابخانەی (ئەفغانی)، هەرچەندە لای زۆربەی نووسەرە ئیسلامییەکانی ئەمڕۆ پەسەند نییە[٨٢].

بەهەشت: کاکەگیان، ئەوە بۆچی نووسەرانی ئەمڕۆی ئیسلامی ئەوەنــدە نــاڕازین لــە هەڵوێستەکانی ئــەم قوتابخانەیــە، بــۆ نمونــە ماموستایەکی وەك (موحەممەد سەعید ڕەمەزان بوتی) کە هیچ نووسینێکی جێگای گومان نییە، لە کتێبی (کبری الیقینیات الکونیــة)[٨٣]دا ڕەخنەیــەکی توندوتیــژی لــە موحەممــەد عەبــدە و قوتابخانەکەیان ئەگرێت، تەنانەت لە (ل٢٤١)ی ئەو کتێبەدا وای نیشاندەدا کە موحەممەد عەبدە بە پیلانی ئینگلیز و دوژمنانی ئیسلام و بۆ لێدانی ئیسلام کرا بە سەرۆکی زانکۆی ئەزهەری پیرۆز، موحەممەد فرید وجدی بۆ ناشیرینکردنی ئیسلام کرا بە

---

[٨٢] دیارە ئەمانە رای قوتابییەکان و قوتابخانەی (ئەفغانی)ن، بەڵام ئەفغانی خۆی رای وا نەبووە.

[٨٣] چاپی سێیەم، دار الفكر، بيروت، ١٣٩٤ك، ص٩٨٠.

سەردەستەی نووسەرانی گۆڤاری (نور الأسلام)ی ئەزهەر[٨٤]، جا نازانم تۆ بۆچوونت چۆنە.

نەورەسی: ملکەچکردنی ئیسلام و قورئان بۆ شێوەی بیرکردنەوەی ڕۆژئاوایی لە لایەن ئەم قوتابخانەیەوە شتێکی ڕاستە و ئەوە لای خۆشمان هەیە، سەیری (تەفسیری خاڵ)ی مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵ، بەرگی سێیەمی چاپخانەی سلێمانی، ساڵی ١٩٧٩ لاپەڕە (١٨٤) و تەفسیری سورەتی (الفیل) بکە، بەڵێ ئەم قوتابخانەیە زۆر پەرۆشی ڕاڤەکردنی قورئانن بە زانستی و زۆر گوێ بۆ هەموو تیۆرێکی زانستی شل ئەکەن، بەڵام بەهەشت گیان، ئەمانە هیچیان ناگاتە جێگای گومانکردن لە خەبات و کارگوزاریی ئەو مامۆستایانە بۆ ئیسلام و بە ڕاستی پیلانگێڕی دوژمنانی ئیسلام نەبون، بەڵکو دڵسۆزی ئیسلام بون، تەنها وەك هەموو بەندەیەك (خاوەنی هەڵە بون) خوا لێیان ببورێ و پاداشتیان بداتەوە.

---

[٨٤] بڕوانە، لاپەڕە (٢٥٠)ی کتێبی ناوبراو، پەراوێز

## قوتابخانەی قورئانناسانی تازە: [٨٥]

ئەم قوتابخانەیە بە پێچەوانەی قوتابخانەکەی ئەفغانییەوەیە، بە هیچ شێوەیەك نەرمی و ڕووپیشاندانیانە بەرامبەر (داروینی) نییە، چونکە لایان وایە:

١. تیۆری داروینی، وەك لێکۆڵینەوەیەکی زانستیی ڕووت نەماوە، بەڵکو بۆتە چەکێك بۆ قەلاچۆکردنی ڕەوشت و مەبەستی ماددیەکان لە بڵاوکردنەوەی داروینی بۆ دۆزینەوەی ڕێگای چۆنێتی پەیدابونی ژیان و مرۆڤ نییە، بەڵکو مەبەستیان ئەوەیە کە بە خەڵکی بڵێن: مرۆڤ ئاژەڵە و لە باوباپیرێکی ئاژەڵی دروستبووە و هاتووە، ئەم ڕەوشت و قیەم و یاسا و ئایینەی دروستکراوە و سەپێنراوە بەسەر ئادەمیزاددا، هەر هەموویان کۆت و پێوەندن و مرۆڤ و هیچ ئاژەڵێکی تر جیاوازییان نییە[٨٦].

٢. مامۆستایەکی موسڵمان لەسەر ئەو ئایەتەی کە خوا ئەفەرمووێ: {وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَاكُمْ}، (الأعراف: ١١) ئەفەرمووێ: (ئەو بە بەردبووانە) و شوێنەوار و ئێسکە ڕزیوانەی داروین کردوونی بە بەڵگەی تیۆرەکەی، هەر هەموو ئەو بەڵگانە

---

[٨٥] (ڕەشنوسی ئیسلام و شارستانیەتی ماددیەت، دفتر ٢، ل٢١٤، چونکە سەرەتای ئەم باسە لەوێ نووسراوەتەوە.

[٨٦] معركة التقاليد، ل١١-٥٨.

گومـانن و ناگەنـە پلـەی دڵنیـایی لێیـان، دانـانی تەمـەنێك بـۆ ئێسکێکی بەردەنی، یان دانانی تەمەن بۆ تەلاشە بەردێکی کۆن، وەك دانانی تەمەن وایە بۆ ئەستێرەکان[٨٧].

٣. لای ئەم مامۆستایانە بە هیچ شێوەیەك نابێ مرۆڤ لە دۆخێکی ئاژەڵی و ناژیریی و چوارپێیەوە هاتبێ و گەشەی کردبێ بۆ ئەم مرۆڤەی ئێستا، بەڵگەش فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوایە ﷺ کە ئەفەرمووێ: (خلق الله آدم علی صورته)[٨٨] واتە: خـوا ئادەمی لەسـەر شـێوەی (ئـەم ئادەمانـەی ئـەمڕۆ) خـۆی و هـەر لـە دروسـتبونی یەکـەمین ئـادەمیزادەوە بـەو شـێوەیە دروسـتبون، کەواتـە مـرۆڤ دروسـتکراوێکی تایبەتییـە و لـە ئاژەڵـەوە گەشـەی نەکردووە.

٤. مامۆسـتا و قوتابییـانی ئـەم قوتابخانەیـە بـە هـیچ شـێوەیەك باوەڕیان بە (باوەڕی داروین بە خوا) نییە، هەر وتەیەکی داروین لـەو بـارەوە بـە کلکـە لەقـەی دائـەنێن بـۆ پیـاوانی کەنیسـە، مامۆسـتایەکی تـر ئەفـەرمووێ: "داروین وتوویـەتی دانـانی دەسەڵات بۆ خوا لە پەیدابونی بونەوەر و ژیاندا لەگەڵ تیـۆری

---

[٨٧] في ظلال، ج٨، ل١٣٧.

[٨٨] (الاسلام بنظرة عصرية)، محمد جزاد مغنية، دار العلم للملايين، بيروت، چاپی دووەم، ١٩٧٨، ص١١٦. هـەروەها (كـبرى اليقينـات الكونيـة) بـوطي، ص٢٧٠.

پەیدابون و گەشەکردن وەك دانانی هێزێکی ئەو دیوی سروشت (میتافیزیکی) لە کارێکی میکانیکی ڕووت، وایە".

ئەم چوار خاڵەی سەرەوە بە کورتی و چڕی بۆچوونی مامۆستا و نووسەران و قورئانناسانی هاوچەرخن بەرامبەر بە داروینیزم.

**بۆچوونی زانایانی (ئەکادیمی) زانستی ڕووت (العلوم الصرفة)**

**تەورەسی:** بەهەشت گیان ئێمە نامانەوێ دژی داروین بین، چونکە لە پاڵپشتی (مۆیدین)ی داروینی خۆمان زانای بەرزمان هەیە، داروینی ئەگەر وەك لێکۆڵینەوەیەکی زانستی بمایە و لە سنوری خۆی پێی ڕانەکێشایە (وەکو تیۆرێك) ئێمە دژی نەدەوەستاین، بەڵام بە داخەوە:

١. داروینی وەك سەلمێنراوێکی زانستی سەیر دەکرێت، بەڵام واش نییە و واتریش نییە.

٢. داروینی بووە بە چەکی قەڵاچۆکردنی هەموو ڕەوشتێك، بەڵام زانستی بێڕەوشت دژی مرۆڤایەتییە، کەواتە نابێ داروینیزم بە چاوی زانست و زانستانە سەیر بکرێت.

٣. دوژمنانی گەلانی هەموو سەر زەوی (جولەکە)یە و ئەوانیش داروینییان کڕی و مۆری خۆیان لێدا و بەبێدەنگ و بێ چرپە کارگوزاری ئەوان دەکات.

بەهەشـت: ئـەی ئەگـەر تیـۆری داروین سـەلمێنراوێکی زانسـتانە نییە، بۆچی لە قوتابخانەکاندا وەك تاقانە ڕێگای زانینی چۆنێتی پەیدابونی مرۆڤ و ژیان ئەخرێتە پێش چاو ؟

نەورەسی: بەهەشت گیان، ئەوانەی کە بەرنامەی خوێندنەکە بۆ قوتابیـان دائـەنێن، نـە زۆر بـە تـەنگ ڕەوشـتەوە، نـە بـە تـەنگی زانســتەوەن، وایــان پێــوتراوە، ئەگــەرنا ئەگــەر داروینــی سەلمێنراوێکی زانستییە بۆچی زۆربەی زۆری زانایانی جیهانی، نـەك زانایـانی ئـایینی، بـەڵکو زانایـانی ئـەکادیمی و زانایـانی بـایۆلۆجی و توێکـاری و زانایـانی زەویناســی و ژیــواری و زانایانی گیانەوەرزانی و بۆماوەزانی و کارئەندام زانەکان، واتـە (علـم وظـائف الأعضــاء)..هتـد، دژیـنی و پـلاری تێـدەگرن و ڕەخنەی توندوتیژی لێدەگرن و بەرپەرچی دەدەنەوە.

خۆ ئەگەر بمانەوێ وتـە و ڕەخنـەی هـەموو زاناکـان بڵێین، نـە بە ئێمە کۆدەبێتەوە، نە بە هیچ کەسێکی تر، بەڵام وا لـە خوارەوە مشتێك لەو خەروارە باس دەکەین:

١. زانـای ئیتـالی بـەناوبانگ (ڕۆزا) دەڵـی: "ئـەو تاقیکردنـەوە ئەزمونگەرییە پیشەسازییانەی ئێمە لەسەر چۆنێتی گەشەکردن

لـه مـاوەی (٦٠) سـاڵی رابـردوودا کردمـان، هـەموویان بەڵگـەی پووچەڵی تیۆری داروین و دژی داروین دەرچوون"[٨٩].

٢. نووسەری لاوەکانی مارکسیزمی فەرەنسی (رۆجیه گارودی) دەڵـی: "لەبـەر ئەمـە، نـە داروینـن و نـە لامـارك گومانیـان نـەبووە لـەوەی بۆمـاوەزانی هەرچـییەکیان کـردووە، هەڵیئەوەشـێنیّ و پردیان ئەدا بە ئاودا"[٩٠].

٣. زانای بەناوبانگ (والاس) لەگەڵ ئەوەشدا کە خۆی داروینییە، دەڵی: "گەشەکردنی گیانداران بە رێگای هەڵبـژاردنی سروشتی هەرگیز بەسەر مرۆڤدا ناچەسپیّ، بەڵکو پێویستە بڵێین یەکسەر و سەربەخۆ دروستبووە"[٩١].

٤. پرۆفیسۆر و زانای ئەتۆمی سویسری (راجۆ هانس هۆرزەلێر) بەیانێکی لە ئێزگەی (پاڵ)ەوە بڵاوکردەوە تێیدا، وتبووی: "لە هەزار بەڵگەدا بەڵگەیەکمان بە دەستەوە نییە کە مرۆڤ لە مەیمون بووبێت، لە ئەنجامی تاقیکردنەوە و پشکنین بۆمان دەرکەوت کە پـێش (١٠) ملیـۆن سـاڵ مـرۆڤ هـەر بە مرۆڤـی ژیـاوە و دوور لـە مەیمون"، هـەروەها پرۆفیسـۆر (هـۆزەلێر) شـەویلگەیەکی مرۆڤـی پێشـکەش کـرد بـە مۆزەخانـەی سروشـتی لـە شـاری پـاڵ، کـە

---

[٨٩] الداروينية، عرض وتحليل، يحيى محمد، ص١٨٩.

[٩٠] هەمان سەرچاوە، ص١٨٧.

[٩١] هەمان سەرچاوە، ص٣١٥.

مێـژووی ئـەو شـەویلگەی مرۆڤـە ئەگەڕایـەوە بـۆ دە ملیـۆن سـاڵ لەمەوپێش"[92].

٥. مامۆسـتا (کاتـەرڤاج) بەڕێوەبـەری مۆزەخانـەی مێـژوویی فەرەنسا لە پاریس، دەڵی: "ئێمە نازانین چۆن ژیان پەیدا بووە، تەنها ئەوەندە ئەزانین گەشەکردن ڕاست نییە، ئەزانین و لێمان ڕوونە کە نـە داروین و نـە لامارك نـەیانتوانیوە ڕێگای ڕاست بـۆ چۆنێتی گەشەکردن بدۆزنەوە"[93].

٦. (جۆرج بـۆهن) زانـای سـایکۆلۆجی و بـایۆلۆجی، دەڵـی: "بـە داخەوە زۆر لە زاناکانی سایکۆلۆژی و بایۆلۆژی خۆیان بێبەش کـردووە لـە ئـەنجامی لێکۆڵینـەوەی زانسـت، چـونکە خۆیـان بەستووە بە تیۆری (هەڵبـژاردنی سروشـتی) لەبەرئـەوە ئـەنجامی تاقیکردنەوەکانیان هەموو نەزۆك و بێئەنجامە"[94].

٧. زانـای ئینگلیـزی (کابیتـان کـووارت) دەڵـی: "ڕێبـازی داروین ڕێبازێکی درۆزن و پووچە، ئەو ڕێبازە یەکەمین هۆی دواکەوتنی شارستانییەتی ڕۆژئاوایە"[95].

---

[92] هەمان سەرچاوە، ص٣١٧.

[93] هەمان سەرچاوە، ص٣٢٢.

[94] الله والعلم الحديث، عبدالرزاق نوفل، ص١٧٩-١٨٠.

[95] عن الانسان والمادية الداروينية، هادي المدرسي.

٨. (د. دوێتـــەر) سەرپەرشـــتیکەری توێژینـــەوەکانی زانکـــۆی (کۆڵۆمبیـــا) لـــە ئـــەمریکا، پشـــتیوانی خـــۆی بـــۆ پرۆفیســـۆری سویســـری (هـــورزە لیـــر)ی خـــاڵی چـــوارەم دەربـــڕی و ڕۆژی (١٩٥٦/٥/٣١) وتـی: "ئەو پرۆفیسۆرە ڕاستی وتووە و تیۆری داروین هیچ بەڵگەیەکی زانستیی بە دەستەوە نییە"[٩٦].

٩. ڕۆژنامەی (الأخبار)ی میسری ڕاپۆرتێکی زانستیی لە ژمارەی ڕۆژی (٢٣-٣-١٩٧٢)دا بڵاوکـــردەوە، ڕاپۆرتەکـــەش ئەمـــەبوو: "ئەنجومـــەنی زانســـتی و فێرکردنـــی مـــیری لـــە ویلایـــەتی (کالیفۆرنیا)ی ئەمریکی بڕیارێکی دەرکرد کە ئاگاداری هەموو مامۆستاکان بکەن و لە کتێبە زانستییەکاندا بنووسن کە تیۆری پەیدابون و گەشەکردنی داروین (تیۆرێکی گریمانەیی)یە نـەك ڕاستی و سەلمێنراوێکی زانستی"، هەروەها هەمان ڕۆژنامە لە گۆڤاری (ئیکۆنۆمێست)ی هەفتانەیی بەریتانی لە ژمارەی ڕۆژی (١٩٧٢/٢/١٠)دا وەریگرتـووە، دیـارە بڕیـاری ئـەم ئەنجومەنـە پشـــت شـــکاندنی تیـــۆری داروینیمـــان پیشـــان دەدات[٩٧]، جـــا بەهەشت گیان، ئەگەر بمانەوێ بۆچوونی زانایانی زانستی تازە لە بارەی داروین و پووچەڵی داروینییەوە بنووسین، تەواو نابێ، بەڵام ئەمە مشتێکە و مشتێکیش نموونەی خەروارێکە.

---

[٩٦] الله والعلم الحديث، عبدالرزاق نوفل، ص١٨٠.

[٩٧] فلسفة اسلامية، محمد جواد المغنية، دار العلم للملايين، ص٩٣٦.

## بوونەوەر و گەشەکردن :

بەهەشت: کاکەگیان، ئایا داروینیزم هیچ بۆچوونی هەیە بەرامبەر بە (گەردون = بونەوەر)؟ ئایا یاسای گەشەکردن ئەویش ئەگرێتەوە، یان تەنها گیاندار و ڕووەکە؟

نەورەسی: ئەوانەی باوەڕیان بە گەشەکردن هەیە دوو جۆرن[98]:

هەندێکیان تەنها باوەڕیان بە گەشەکردنی زیندەوەران (گیاندار و ڕووەك) هەیە و هەندێکی تریان باوەڕیان بە گەشەکردنی هەموو بونەوەر هەیە (بە هەرچی ماددە و وزە و تیشك) هەیە.

بەشی یەکەم: ئەو زانایانە بون پێش داروین باسی گەشەکردنیان کردووە، بەلاّم داروین خۆی و داروینیزمی تازە باوەڕیان بە گەشەکردنی هەموو بونەوەر بەسەروبەرەوە هەیە و لەم ڕووەوە چەند تیۆرێك هەیە وا بە کورتی باسیان دەکەین:

١. **تیۆری دروستبونی یەك لە دوای یەك ( الخلق المستمر ):**

ئەم تیۆرە مەبەستی ئەوەیە کە پارچەکانی بونەوەر یەك لە دوای یەك دروستبون، بەلاّم بە پێچەوانەی گەشەکردن، هیچیان لە هچیان دروستنەبون، واتە: هەتاوی خۆمان لە پێش زەویدا دروستبووە، زەوی پێش مانگ و...هتد

---

[98] موسوعة عقاد، عباس محمود العقاد، الجزء الرابع، القرآن والأنسان، ص٢٨٩.

دروستبونی هیچیان پەیوەندی بەوی تریانەوە نییە و لە یەکتری جیا نەبونەتەوە، بەڵام بە هۆی دژایەتیی ئەم تیۆرە لەگەڵ تیۆرە زانستییەکانی سەردەمدا، پووچ بوویەوە و بە درۆخرایەوە[99]. بە پێی ئەم تیۆرە کۆتایی بۆ گەردون نییە. ئەمەش هۆی سەرەکی سووتاندنی (برۆنۆ)[100] بوو.

٢. تیۆری کشان و چوونەوەیەك (التساع والإنكماش):

ئەم تیۆرە بۆچوونی وایە کە بونەوەر وردە وردە ئەکشێت و فراوان دەبێ و تا ڕادەیەك پاش ئەو ڕادەیە دیسان وردە وردە دەچێتەوە یەك و پارچەکانی وردە وردە لە یەك نزیك ئەبنەوە و دیسان دەست دەکەنەوە بە کشان و بە چوونەوەیەك، هەر بەو شێوە بەردەوام دەبێ، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم تیۆرە بە پێی یاسای (چوارەمی دینامیکای گەرمی) بە درۆ خرایەوە[101]، لە لایەکەوەو لە لایەکی ترەوە زانست سەلماندوویەتی کە هیچ پارچەیەکی بونەوەر تا سەر نامێنێ و بونەوەر خۆیشی نامێنێ و زەوی

---

[99] الداروينية، عرض وتحليل، يحديى محمد، ص١٢٩.

[100] بڕوانە: (بداية الكون من الأفلاك الى البشر، جونيظار، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی، د. محمد الشحات مؤسسة سجل العرب، قاهرة، ١٩٧٥، ص٣٨.

[101] الداروينية، عرض وتحليل، يحديى محمد، ص١٢٩.

ئەگۆڕێ بە زەوییەکی تر[١٠٢]، چونکە وەك سەلمێنراوێکی زانستی زاناکان سەلماندوویانە کە وزەی خۆر تا سەر نامێنێ و وزەی خۆریش نەما زەوی چۆن دەردەچێ؟

زاناکان دەڵێن: "ئەو وزەیەی ئەستێرەکان ئەیبەخشنەوە بریتییە لە گۆڕینەوەی هایدرۆجینی نێو ئەستێرەکان بۆ هیلیۆم، گۆڕینی هەر ناووکە ئەتۆمێکی هایدرۆجینی بۆ هیلیۆم لە ($٢\times١٠^{١٢}$) تا وزە، خۆ هەتاویش لە هەر چرکەیەکدا ($١٠^{٢٦}$) تا وزە (سعرة حرارية) فڕێ ئەدات، واتە: لە هەر چرکەیەکدا (٨٠٠) ملیۆن تەن هایدرۆجین فڕێ ئەدات[١٠٣]، جا بزانە ڕۆژی چەند و ساڵی چەند وزە خەرج دەکات، کەواتە خۆر بەرەو نەمان ئەڕوات، هەروەها پارچەکانی تری بونەوەر.

٢. **تیۆری گەشەکردن (تطور):**

ئەم تیۆرە دەڵێ: "پێش (٢٠) ملیۆن ساڵێك گەردون بریتی بوو لە تۆپەڵە گڕێك، لە ئەنجامدا تەقییەوە و ئەم پارچانەی گەردونی

---

[١٠٢] (يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ وَبَرَزُواْ للهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ) (إبراهيم : ٤٨)

[١٠٣] (نشوء الكون) جورج گاموڤ، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی، مؤسسة فرانكلين للطباعة والنشر، قاهرە، نیویورك چاپخانەی (النهضة)ی میسری، ١٩٦٠، ص٤٢

لێدروستبوو، ئەمە بۆچوونی زۆربەی زۆری زانایانە[104]، ئەو تۆپەڵە گڕە بریتیی بوو لە گازێکی هەورین کە تا ئێستا ئەو ماددە سەرەتاییەی ئەو گازە لێی دروستبووبوو، لەگەڵ ئەم ماددانەی ئێستا ماوە[105]، قورئانی پیرۆز لە ئایەتی ژمارە (٣٠) سورەتی (الأنبياء)دا ئەفەرمووێ:

{ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ } ، ( الأنبياء : ٣٠ )[106]

واتە ئەوە بۆ مەردوومە کافرەکان سەیری ئاسمان و زەوی ناکەن، کە کاتی خۆی یەك تۆپەڵە بون، ئێمە تەقاندمانەوە و لێکمان جیاکردنەوە و لە ئاو هەموو زیندەوەرێکمان دروستکردووە و بە هۆی ئاوەوە بژێویمان پێبەخشیون، کەواتە ئەم تیۆری تەقینەوەی گازە سەرەتاییە بونەوەر نزیکترین تیۆرە بە قورئانی پیرۆز، دیسان زاناکان (زانایانی خاوەن ئەم تیۆرە، وەکو: ئەنشتاین و کانت و هاملتون و... هتد) پێیان وایە کە

---

[104] (الجيولوجيا العامة) د. عبدالهادي الصائغ، وە د. فاروق العمري، زانکۆی موسڵ، چاپی دووەم، چاپخانەی زانکۆی موسڵ، ١٩٧٧، ص٣٠.

[105] بداية الكون من الأفلاك الى البشر، جۆن ڤایفەر، ص٨.

[106] دیسان دەفەرمووێ: (ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ ) (فصلت : ١١ ) واتە: کاتێ خوا ویستی ئاسمان دروست بکات، ئاسمان دوکەڵ (سەدیم ، گاز) بوو.

بونەوەر بە گشتی لە گەشەکردندایە، بەڵام نەك وەك گەشەکردنی بایۆلۆجی زیندەوەران و تیۆری داروین، بەڵکو مەبەستیان لە گەشەکردنی بونەوەر فراوانبونی گەردونە، لەم ساڵانەی دواییدا و بە هۆی ڕوانگەی تازە داهێنراوی بەهێزەوە بۆ زانایان دەرکەوتووە کە پارچەکانی بونەوەر بە شێوەیەکی ترسناك لە یەکتری جیائەبنەوە و گەردون فراوان دەبێ[١٠٧].

ئەم فراوانبون و لێك دورکەوتنە بە پێی تیۆری (نیسبی ئەنشتاین) و هەر چوار لاکەی (مادده و جموجوڵ و کات و شوێن) دەبێتە سەرەخۆرەی گەردون[١٠٨].

بەهەشت: کاکەگیان ئەم زەوییەی خۆمان چۆن دروستبووە و ژیانی لەسەر پەیدا بووە؟

نەورەسی: بەهەشت گیان، زەوی و خۆر و هەموو کۆمەڵەی خۆر، بە یەك شێوە و لە یەك کاتدا ژیانیان تێدا دەستیپێکردووە، چۆن زەوی دروستبوو؟ چۆن ژیانی لەسەر پەیدابوو؟ دوو پرسیاری جیاجیان و زاناکان خاوەنی بۆچوون و تیۆری جیاوازن لە بارەی هەر یەکەیانەوە.

---

١٠٧ کەچی قورئانی پیرۆز ئەفەرمووێ: (وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ) (الذاريات : ٤٧ )

١٠٨ الداروينية، عرض وتحليل، يحديى محمد، ص١٢٨-١٢٩.

چۆن زەوی پەیدابوو ؟

بەهەشت: باشە ئێستا باسی بۆچوونی زاناکانم بۆ بکە لە بارەی چۆنێتی پەیدابونی زەوی و دواجار (ژیان).

نەورەسی: بۆ چۆنێتی پەیدابونی زەوی، زاناکان خاوەنی سێ تیۆری جیاجیان:

١. زانای گەردونناسی ئەڵمانی (عەمانوئیل کانت) خاوەنی تیۆری (سەدیمی) لای وایە: "خۆر و کۆمەڵەکەی، کە زەویش ئەندامێکی کۆمەڵەکەیەتی، بریتیی بوو لە (سەدیمێکی گازین)[١٠٩] و لە پلەیەکی گەرمی زۆر بەرزدا، جا ئەم سەدیمە بە هۆی (کێشکار . جاذبیة)وە دەستیکرد بە چوونەوەیەك و وردە وردە بونە چەند پارچەیەك و وەك دەنکە موروو (دەنکە تەزبیح)ی لێهات لە پاشان وردە وردە قەوارەیان زیاد بوو، بەم شێوەیە خۆر و کۆمەڵەکەی (زەویش) دروستبوو، وردە وردە سارد بوویەوە، هەتا وەکو ئەم زەوییەی ئێستای لێهات.

٢. لە ساڵی (١٨٢٤ز) زانای فەرەنسی (لابلاس) هات و دەستیکرد بە سمارتەلێدانی تیۆرەکەی (کانت) و وتی: "بەڵێ، کۆمەڵەی خۆر بریتیی بوو لە سەدیمێکی ناگرین، بەڵام بە هۆی هێزی کێشکردنەوە نەبوو، بەڵکو بە هۆی کەمبونی پلەی

---

[١٠٩] سەدیم: بریتییە لە پارچەیەکی بوونەوە و. کە پێکهاتووە لە ژمارەیەکی زۆر ئەستێرە و لەبەر زۆری و دووری بە شێوەی هەور دەبینرێت.

گەرماکەیــەوە چــوونەیەك و خێرایــی ســوڕاندنەوەی بــە دەوری خۆیدا، پارچە پارچە بوو، کۆمەڵەی خۆری لێدروست بوو"[١١٠].

٣. لـەم دواییـەدا چـەند زانایـەکی وەك (گامیـەرین و مۆڵتـەن و پارل) پەیدابون و تیۆرێکی تازەیان لە بارەی چۆنێتی زەوییـەوە دانـا، کـە کورتەکەشـی ئەوەیـە دەڵـێن: "خـۆر و کۆمەڵەکـەی، سـەدیمێکی گـازی نـەبوو، بـەڵکو سـەدیمێکی پێچاوپێچ بـوو لـە ئەتۆمی گڵ و کانزا دروستبوو، نەك گاز، ئەم سەدیمە بە شێوەی ئەستێرەیەکی گەورە ئەدرەوشایەوە، وا ڕێکەوت! کە خۆی کێشا بە ئەستێرەیەکی تردا و پارچە پارچە بوو، ئەم خۆر و کۆمەڵەی لێدروستبوو.

بـەڵام بەهەشـت گیـان، زانایـانی ئێسـتا بـەم سـێ تیـۆرەوە نەوەسـتاون، بـەڵکو تیـۆر زۆر بـووە[١١١]، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا هـەر هەموو ئەو تیۆرانە کەلەبەری گەورە گەورەیان دێتە ڕێگا و بۆیان پڕ ناکرێتەوە، وەك ئەوەی هەموویان هۆی تەقینەوەی سەدیمەکە ئەدەنـە دەسـت بـەرزی پلـەی گـەرما و دەڵـێن: وردە وردە ساردبووەتەوە و بەرەو ساردبونەوەش ئەڕوات، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە هەموو زانا جیۆلۆجییەکان لەسەر ئەوەن زەوی

---

[١١٠] الداروينية، عرض وتحليل، يحديي محمد، ص١٢٤.

[١١١] (نظرية أصل الأرض) ئۆتۆشمیتی ڕوسی، وەرگێڕانی: مجدی نصيف، دار المعارف، مصر، ص١٥-٧٦.

بـە ڕۆژگارێکـدا تێپـەڕی کـرد کـە سەرانسـەری زەوی (کـەمێکی نـەبێ) بـەفر و سـەهۆڵبەندان داپۆشـی بـوو، کـە پێـی دەڵـێن: (چـەرخی سـەهۆڵبەندان)، ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێ کـە پلـەی گەرمای زەوی ئەو کاتە کەمتر بووە لە ئێستا.

بەهەشـــت: ئەمـە بۆچـوونی زاناکـان بـوو لـە بـارەی چـۆنێتی پەیدابونی زەوییەوە، ئەی قورئان لەم بارەوە هیچ نافەرمووێ؟

نەورەســـی: چـۆن قورئـان هـیچ نافـەرمووێ! هەرچـەند قورئـان کتێبێکـی زانسـتیی ڕووت نییـە، بـەڵام بـۆ هـەموو هەڵوێسـتێکی زانستی پەنجەی ڕاکێشاوە، بۆ چۆنێتی دروستبونی بونـەوەر، زەوی، مرۆڤ، بۆ هـەر هـەموویان بە شێوەی لاتیر دەستنیشـانی کـردوون، بـۆ نموونـە قورئـانی پـیرۆز لـە سـورەتی (النازعـات) ئایەتی (٢٧-٣٣)دا ئەفەرمووێ:

{ ءَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ السَّمَاءُ بَنَاهَا ﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّاهَا ﴿٢٨﴾ وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا ﴿٢٩﴾ وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَاهَا ﴿٣٠﴾ أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءَهَا وَمَرْعَاهَا ﴿٣١﴾ وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا ﴿٣٢﴾ مَتَاعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ ﴿٣٣﴾ }.

١. ئایا دروستکردنەوە و زیندووکردنەوەی ئێوە گرانترە، یان دروستکردنی ئاسمان، ئەستێرەکان و پارچەکانی تری بونەوەر، دروستیکردون و هەر یەکە خولگەیەکی تایبەتی بۆ دیاریکردون.
٢. بەرزی کروونەتەوە (وەك پەڵە هەور) ئەستوری و قەبارەی داونەتێ.
٣. دوایی رێکی کردوون و بەو شێوە بێیاساییە نەیهێشتەوە.
٤. دوایی تاریکی کرد، وەك شەوەزەنگ.
٥. ( بە هۆی تەقینەوەی هەتاوەکان ) هەتاوی دروستکرد و ئەو تاریکاییەی کرد بە چێشتەنگاو.
٦. لە پاشان زەوی هێنا و بە شێوەی هێلکەیی دایڕشت.
٧. ئاوی لێدەرهێنا و پاوەن و لەوەڕگای دروستکرد.
٨. بە هۆی ئەو لافاو و ئاوەوە شاخ و کەژ وکێوی دروستکرد بۆ سەلماندن و لەنگەری زەوی.
٩. ئەمانە هەموویان بۆ ئێوە (دروستکردنی ئێوە) و خۆشگوزەرانی خۆتان و ئاژەڵەکانتان[١١٢].

بەهەشت گیان، لە کاتێکدا کە لە ئەوروپا (رۆگەی لاوانی سەرلێشێواوی ئێمە)، زاناکانیان لەسەر خڕی زەوی ئەکوشت و ئەیانسوتاندن، زاناکانی ئێمە بە مێژەز و پیشەوە لە نەیسابوور

---

[١١٢] (التفسير الكاشف)، محمد جواد مغنية، دار العلم للملايين، بيروت، چاپی دووەم، ١٩٧٨، بەرگی حەوتەم، ص٥١٠.

و نزامیەی بەغداد و ئەندەلوس لە ژێر ڕوانگەی (مرصد)ی ئەستێرەناسیدا دائەنیشتن و تیۆری زانستییان لە زانستی گەردونزانی و زانستەکانی تردا ئەنووسی، دیارە ئەوەش لەبەرئەوە نەبووە وەك ئەوروپا لە ئایینەکەیان بێزار بووبن و لێی هەڵبێن، بەڵکو ئایینەکەمان فەرمانی دابونێ و بۆی دەرخستبون کە زەوی خڕە، ئەمانیش لەو ڕێچکەوە چاکی لێکۆڵینەوەیان لێهەڵکردبوو.

**بەهەشت:** کاکەگیان کوا قورئان ئەفەرمووێ: زەوی خڕە؟

**نەورەسی:** بەهەشت گیان، خوا ئەفەرمووێ:

١. ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴾، (النازعات : ٣٠ )

هەروەك لە پێشەوە وتمان مانای (خوا زەوی بە شێوەی هێلکەیی دروستکرد) (دحیة) لە زمانی عەردبیدا بە هێلکە دەڵێن، جا توخوا زەوی خڕە، یان هێلکەییە؟[١١٣]

٢. یان کاتێ خوا باسی کۆتایی ژیانی سەر زەوی دەکات ئەفەرمووێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلۡأَرۡضُ زُخۡرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتۡ وَظَنَّ أَهۡلُهَآ أَنَّهُمۡ قَٰدِرُونَ عَلَيۡهَآ أَتَىٰهَآ أَمۡرُنَا لَيۡلًا أَوۡ نَهَارٗا ﴾، (یونس : ٢٤ )

---

[١١٣] (القرآن محاولة لفهم عصري، د. مصطفى محمود، ص٢٢٣. المنجد في اللغة، ص٢٠٨، كلمة دحي.

واتــە: ئـەو کاتــەی کـە زەوی خــۆی ئەڕازێنێتــەوە. بــە گڵـۆپی ڕەنگاوڕەنگ و کۆشکی ڕەنگاوڕەنگ و باڵا و کارگـە و ...هتـد، هەروەها خۆی ئەنەخشێنێ، بە کشتوکاڵ و بە دەگمەن جێگای بێت شین نەکاتەوە، دانیشتوانی سەر زەوی (مرۆڤ) وائەزانن بە تەواوی زاڵبون بەسەریدا، هێز تەنها هێزی ئەوانە، ئا لەم کاتەدا فــەرمانی (نــەمانی مــرۆڤ و ژیــان) لــە لایــەن ئێمــەوە (خــوا) دەردەچێت و وادەی لەناوچوونی دێـت، کـە هـەم شـەو و هـەم ڕۆژە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە لایەکی گۆی زەوی ڕۆژە و لایەکی شەوە، ئەمەش تەنها خڕی زەوی ئەبێ: هیچی تر ناگەیەنێ.

٣. قورئان ئەفەرمووێ: { فَلَآ أُقْسِمُ بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ } (المعارج : ٤٠ ) واتــە: خــوا خــاوەن و پــەروەردگاری ڕۆژهەڵاتــەکان و ڕۆژئاواکانــە، ئەگــەر زەوی خــڕ نەبوایــە و تــەخت بووایــە یــەك ڕۆژهــەڵات و یــەك ڕۆژئــاوای ئــەبوو[١١٤]، بـەڵام چونکە زەوی خـڕە، هەموو چرکەیەك بەسەر گۆی زەویدا تێپەڕ دەکات لە پارچەیەکی ڕۆژئاوا دەبێـت و لـە پارچـەیەکی تـری ڕۆژ هەڵدێ، بەو چرکەیە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایەك دروست دەبێ[١١٥].

---

[١١٤] (حوار مع صديق الملحد)، د. مصطفى محمود، چاپخانەی روز اليوسف، چاپی یەکەم. ١٩٧٤ز، ص٨٣.

[١١٥] موحازەرەی ڕۆژی (١٩٧٨/٦/٢٥) لە مزگەوتی گەورەی سەیدصادق.

٤. ئەگەر بۆچوونی هەموو زانا موسڵمانەکانیش لە بارەی خڕی زەوییەوە بهێنینەوە زۆرمان ئەوێت، بەڵام وا نموونەی بۆچوونی زانایەکی موسڵمان ئەهێنمەوە، با چاك بزانین کە لەو کاتەدا لە ئەورووپای ئاژەڵیدا (برۆنۆ) ئەسوتێنرا لەسەر خڕی زەوی و موسڵمانان و زانایانی ئایینی موسڵمان چییان وتووە، زانای گەشتیار و مێژوونووسی ئیسلامی (مەسعودی) کە ساڵی (٩٥٦ز) کۆچی دوایی کردووە (واتە پێش هەزار و ئەوەندە ساڵ) دەڵی: "من بەوەدا ئەزانم کە زەوی خڕە، چونکە هەر کاتێك هەتاو لە سەرووی چین ئاوابوو، لە دوورگە ئاوەدانەکانی ناو ئۆقیانووسی ڕۆژئاوایی هەڵدێ، ئەگەر لەم دورگانە ئاوابوو لە سەرووی چین هەڵدێ، کەواتە ئەمە نیوەی بازنەیی زەوییە"[١١٦]؛ هەزاران بۆچوونی تری زاناکان هەیە لەم بارەوە، جا وەرە سەیری پێشکەوتنی زانایانی خۆمان بەسەر زانایانی ئەورووپا و هەموو شۆڕشێکی ئەورووپیدا بکە.

---

[١١٦] مروج الذهب، مسعودي، بەرگی یەك، ص٨٦. کتێبی (صورة الكون) د. محمد عبداللطيف، مطلب سلسلة الموسوعة الصغيرة، ٣٥. چاپخانەي دار الحرية، بغداد، ١٩٧٩، ص٤٦-٤٧.

ئەی ژیان چۆن پەیدا بوو ؟

بەهەشت: ماشائەڵڵا کاکەگیان لەم قورئانە پیرۆزە بێخەوشە، چۆن بە روونـی و جـوانی هـەموو کێشـەیەکی ئـەم مرۆڤـە: کێشـەی رامیـاری، بـیرەوەری، ئابووری... هتـد، چارەسـەر دەکـات و دەیداتەوە دەستی.

نەورەسی: بەهەشت گیان، قورئان وەك بەرنامەیەکی ژیان لای ئێمە نییـە، لـە راسـتیدا ئـەتوانین قورئـان بکـەین بـە دوو قورئـان، قورئانێك بۆ پارەپەیداکردن و کتێب گرتنەوە و فاڵچێتی و فتوا فرۆشتن و هەندێ لات و لووت لەسەری بژی، قورئانیان ئەوێ بۆ ژیانی خۆیان، قورئانێکی تر کە بەرنامەی ژیان و لەگەڵ خوێن و گۆشـتی لاوان تێکـەڵ دەبـێ و ئەیکاتـە چرای رێگـای ژیـانی و ئەمانـە ژیانیـان بـۆ قورئـان ئـەوێت، داخ و ناسـۆری قورئـان فرۆشانی زۆرم لە دڵدایە و بەم زووانە کۆتایی نایەت.

بەهەشـت: خـوا تۆڵـەیان لێبسـەنێ، با بێینـەوە سـەر باسـەکەی خۆمان. دوای ئەوەی باسی چۆنێتی پەیدابونی زەویت بۆ کردم، دیارە پرسیارێك قەرزداریت.

نەورەسی: پرسیاری چی؟

بەهەشت: ئای وا زوو لە یادت چوو! پرسیاری (ئەی چۆن ژیان لەم سەر زەوییەدا پەیدا بوو؟ ).

نەورەسی: خۆ راست دەکەیت، ئای بەهەشت گیان.

خوشکێ گیان. وەڵامی ئەم پرسیارە وەك لە کتێبی (سروشت لە تەرازووی ژیریدا)[117]، وتراوە پرسیارێکی گەلێ گرانە و زاناکان (زانا ڕاستەقینەکان نەك بۆرە نووسەر) نقەیان دێ لە ژێر ئەم پرسیارەدا و قوڵی مەردانەی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیان لێهەڵماڵیوە و وێڵن بە دوای وەڵامی تەواودا.

**بەهەشت:** ئەی گوایە هیچ تیۆر و بیرو بۆچوونێکیان نییە؟

**نەورەسی:** چۆن نیانە. بیر و بۆچوونی زۆر و تیۆری زۆر. بەهەشت گیان، کورتەی تیۆرەکانیان بەو شێوەی خوارەوەیە:

**١. تیۆری ژیانی خواستوو:**

هەندێ زانایانی وەك (کەلڤن)ی ئینگلیزی و (هولمۆلتەن)ی ئەڵمانی پێیانوایە کە ژیان لە ئەستێرەیەکی ترەوە هاتووە بۆ زەوی و زەوی بە (دەسەنە) ژیانی لە ئەستێردیەکی ترەوە بە ترانزێت بۆ هاتووە[118]، جا وردە وردە ئەو خانە زیندوودی کە لەسەر ئەو ئەستێرە دوورەوە هات (یاخوا بەخێربێ) گەشەیکرد و ئەم ژیانەی لێدروستبووە، ئەو خانەیە بووە بە بناغەی ژیانی

---

[117] گۆڤاری (ئەستێرە) ژمارە ٢٢، (١٣٥١/١/١) هەتاوی، بڵاوکردنەوەی قوتابخانەی قورئان لە سنەی ئێران، چاپخانەی خەبات، ص١٩٧٩ز. ل٢٢-٢٣.

[118] (طريق الامان) سميع عاطغ الزين، دار الكتاب اللبنانيين، چاپی سێیەم، ١٩٧٧، ص٧٩-٨٠.

سەر زەوی.. بەڵام ئەم تیۆرە لە بەرامبەر بۆچوونی زاناکانی تردا شکستی خوارد، چونکە:

أ/ ئەو خانە زیندووەی بیەوێ لە ئەستێرەیەکەوە بێت بۆ سەر زەوی (یان بە ڕێکەوت بێت) دەکەوێتە بەر هەزاران شەپۆلی گەردونە تیشك (الأشعة الکونیة) و هەرگیز بە زیندوویی ناگاتە سەر زەوی[119].

ب/ هەرگیز و هیچ زیندەوەرێك (نەك خانەیەکی زیندوو) توانای بەرگەگرتنی ئەو هەموو گەرما سوتێنەرە و سەرما کوشندەیە و دۆخی ژیانی سامناك و ئاڵۆزەی نییە[120].

ج/ هیچ زیندەوەرێك ناتوانێ ئەو ئەستێرەی تێیدا ئەژی بەجێی بهێڵێ و بەرەو ئەستێرەیەکی تر بڕوات، بەبێ (ئۆپۆلل و سیوز) بگاتە ئەو ئەستێرەکەی تر.

د/ ئەم تیۆرە چۆنێتی دروستبونی یەکەم خانەی زیندوو ڕواڵەتی ژیان باس ناکات و ڕاڤەی ناکات؛ بەڵکو بە خەیاڵ و بێ بەڵگە، ژیان لە ئەستێرەیەکەوە ئەخوازێ بۆ ئەستێرەیەکی تر[121].

لەبەرئەوە ئەم تیۆرە خرایە پشتی کەنووەوە.

---

[119] (علم الحیوان العالم) للصفوف الجامعة الأولى، د. محمد عمارة الراوي و کۆمەڵەکەی چاپی دووەم، دار الحریة، بغداد، ١٩٧٥، ص٤٥.

[120] هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو. (آراء في الحیاة والتطور العضوي)، عزالدین تقو، ص١٨.

[121] الداروینیة، عرض وتحلیل، یحیی محمد، ص١٣٧.

**٢. تیۆری سروشتی (فیزۆکیمیاوی)**

زانایانی ئەم تیۆرە بریتین لە زانای ڕوسی (ئەلکسەندەر ئۆپارین) و زانای ئینگلیزی (هاڵدین) و هەندێ زانای تر، کورتەی ئەم تیۆرە دەڵی: "پێش دوو ملیۆن ساڵ باری زەوی چاك بووە بۆ ئەوەی ژیانی لەسەر پەیدا ببێ، ئا لەم کاتە زۆر دوورەدا کە ڕووی زەوی بە هەمە جۆرە گازێك داپۆشرابوو، گازی هایدرۆجین ($H_2$) گازی نەوشادر (ئەمۆنیا) ($NH_3$) و گازی میسان($CH_4$) و هەڵمی ئاو ($H_2O$) بە هۆی هەورە بروسکە و بزیسکەی کارەبایی هەورەگرمە و چەخماخەوە وزەیەکی زۆرو بە لێشاو بەری ئاسمانی داگرتبوو، سەرەڕای وزەیەکی زۆری تیشکی وەنەوشەیی لە هەتاوەوە بەرەو ڕووی زەوی هاتبوو، کە ئەو تیشکانە هەورەکانیان دڕی بوو و خۆیان ئەگەیاندە ئەو ئاوانەی لە دەریا و ئۆقیانووسەکاندا بون. ئەو ئاوانەش گازی ئەمۆنیای تواوە و گازی میسانی تواوە و خوێی تواوەی تێدابوو (وەکو لە ناو گازەکانی ڕووی زەوی تێدابوو) ئەم ماددانە بە هۆی ئەو هەورە بروسکە تیشکانەوە یەکیان گرت و شێوەیەکی زۆر سادە، ژیانیان دروستکرد"[١٢٢].

---

[١٢٢] (علم الحیوان العالم) للصفوف الجامعة الأولى، د. محمد عمارة الراوي و کۆمەڵەکەی چاپی دووەم. دار الحریة، بغداد، ١٩٧٥، ص٤٥-٤٦.

ئەم تیۆرەش ڕێی تێناچێت و دڵنیاییمان نادات بە دەستەوە لە بارەی چۆنێتی پەیدابونی سەرەتایی ژیانەوە، چونکە:

ا/ زانای کیمیاگەری ڕوسی (ئەلەکسەندەر ئۆپارین) کە سەر مەشقی زانایانی ئەم تیۆرە بوو، لە ساڵی (١٩٣٨ز)دا یەکەم کەس و یەکەم زانا بوو ئەم تیۆرەی بڵاوکردەوە، لە ساڵی (١٩٥٩) کۆنگرەیەکی زانستیی هاوبەشی لە زانایانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە نیۆرك بەسترا بۆ زانینی چۆنێتی سەرەتای ژیان و سەلماندنی ئەو تیۆرانەی زاناکان لەو بارەوە وتوویانە (ئەم تیۆرەش) پاش لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی هەموو تیۆرەکان بڕیاری کۆنگرە دەرچوو بەوەی (زانینی چۆنێتی پەیدابونی ژیان) تا ئێستا نەزانراوە[١٢٣].

ب/ پاش گەڕانەوەی (ئۆپارین) لەو کۆنگرەیە، هەر لە ساڵی (١٩٥٩) ئاژانسی دەنگوباسی ڕوسی هەواڵێکی بڵاوکردەوە و تێدا وتبووی (ئەلکسەندەر ئۆپارین) سەرۆکی خوێندنگای کیمیاوی زیندەگی (معهد الكيميا الحيوي) لە ڕوسیا، پاش لێکۆڵینەوە و توێژینەوە ماوەی (٢٣) ساڵ وێڵی دۆزینەوەی (چۆنێتی پەیدابونی ژیان) بووە، خەریکی ئەوەبووە کە بتوانێ بە ڕێگای یەککگرتنی کیمیایی خانەیەکی زیندوو دروست بکات،

[١٢٣] (قصة التطور) د. انور عبدالعليم، ٢٣/١١. (كبرى اليقينات الكونية) د. محمد سعيد رمضان البوطي، چاپی سێیەم، ص١٠٤-١٠٥.

بڵاویکردەوە کە "هەرگیز ژیان لە هیچەوە پەیدا نابێ و هەرگیز بە کارلێککردنی کیمیایی ژیان دروست نابێ، هەرگیز ژیان بە زاوزێی خۆیی دروست نابێ و زانست بۆی نییە خۆی بە لێکۆڵینەوەی ئەو دیوی ماددەوە خەریك بکات"[١٢٤].

ج/ ئەگەر ئەو زانایانە ڕاست ئەکەن، ئەی بۆچی ئێستا ژیانی تازە لە ڕۆخی دەریاکان دروست نابێ، خۆ ئێستاش دەریاکان و ئۆقیانووسەکان زۆر و ماددەیەکی زەبەندی (ئەندامی ئۆرگانی)یان تێدایە؟

کە هیچ زانایەك ناتوانێ لە باری زەوی (بۆ ژیانی ئەو کاتە) پێش دوو ملیار ساڵ، بچەسپێنێ و هیچ بەڵگەیەکی (خەیاڵی نەبێ) بە دەستییەوە نییە و بەڵام وا لە بەرچاوی هەموومانەوە دۆخی ئێستای زەوی زۆر لە بارە، بۆچی دروست نابێ و ژیانی تازە دەستپێناکاتەوە.

د/ بۆ دروستبونی یەك بەش لە ترشەڵۆکی ناوکی (ناوکە ترش . D.N.A) کە لە ناوکی خانەی زیندوودا هەیە، پێویستمان بە ڕیزکردنی (١٠) هەزار جوتە تفتی نایترۆجینی هەیە، ئەوانیش (ئەدنین و سایمین و گوانین و سایتۆسین) ئایا ڕاستە ئەو (١٠) هەزار جووتە تفتەی هایدرۆجین هەر بە ڕێکەوت بە بێدەستێکی

---

[١٢٤] (کبری الیقینات الکونیة) د. محمد سعید رمضان البوطي، چاپی سێیەم، ص١٠٥.

توانا یەك بکەوێت؟ دەبێ بەپێی یاسای ڕێکەوت (١) دژی چەند بووەستێ ؟[١٢٥].

ه/ ئـەوە لـە کتـێبی (سروشـت لـە تـەرازووی ژیریـدا) تاقیکردنەوەکـەی زانـای سویسـری (جـارلز یـوگین گای)مـان باسکرد، کە بە تاقیکردنەوەیەکی ماتماتیکی سەلماندی تەنها بۆ دروستبونی یەك تاقە گەردی پرۆتینی و بێ پێویستی بەهێزی خـوایی، پێویسـتی بـە ملیـۆن جـار ئەوەنـدەی ئـەم بونـەوەرە (بونـەوەر نـەك زەوی) مـاددەی تـر و زیـاتر لـە هـەموو تەمـەنی بونەوەر کاتمان ئەویٚ بۆ ئەوەی ئەو تاقە (مۆلیکیول) پرۆتینییە دروسـت بـبێ[١٢٦]، وا ئـەم تیۆرەشمـان زانسـت و زاناکـان وەك بینیمـان، بەرپەرچـیان دایـەوە و وەڵامـی ڕاسـتەقینەی پرسیارەکەیان نەداین بە دەستەوە.

٢. زاوزێی خۆیی ـ خۆڕسك (التوالد الذاتي)

بەهەشـت: کاکـەگیان دوێـنێ لـە زانکـۆ ئـەو بۆچوونەی تـۆم بـۆ خوشـکێکی (نامولتـەزیم)م بـاس دەکـرد، هەرچـەند تەمـەڵترین قوتابی پۆلەکەیە، چونکە هەر خەریکی چپە چپە لەگەڵ کوڕان و

---

[١٢٥] (ڕێکەوت لە تەرازووی ژیریدا) ص٢٣-٣٢، ئەوەشمان لە یاد نەچێت، یەکەم ڕێکـەوت جارێك ڕوویـدا ئیتر دووبارە نابێتـە دووەم یاسـای ڕێکـەوت (١) دژی (١٠) ئەوەستێ.

[١٢٦] (آراء في الحياة والتطور العضوي)، عزالدين تقو، ص٢٤.

هەتیو و مەتیودا، کەچی دەیوت جا ئەم سەرئێشەییە بۆ چییە، لە هەر جێگایەك ئاو بڕژێنی، یان گۆشتێکی گەنیو فڕێ بدەیت، پاش ماوەیەکی کەم میکرۆب و کرم هەڵدێنێ و ژیان دروست دەبێ، ئیتر ماوەمان ئەوەندە نەمابوو هەڵەکەی بۆ ڕاست بکەمەوە، کاتی وانە هات و دواییش لێکجیابووینەوە.

ئەورەسی: بەهەشت گیان، من نەمووت ئەم ماددیانە خۆیان کۆنەپەرستن و دەیانەوێ بە زۆر ملی زانست بچەمێننەوە و بە ئارەزووی خۆیان و لە قاڵبی مێشکی بە تاڵی ئەواندا دایڕێژن.

ئەم بیرە هەڵەیە پێی ئەوترێ (خۆرسك) ئەم بیرە کۆنە پاشخوانی ئەغریقی و یۆنانییە، ئەرەستۆ لای وابوو مشك بە هۆی زەوی شێدارەوە دروست دەبێ، لە ماددیەکانیشدا (هەلمونت، ١٥٧٧-١٦٤٤) پشتگیری بۆچوونەی ئەرەستۆی کرد، (هیگڵ)یش لای وابوو ئەتوانێ لە ماددەی بێگیان گیاندار دروست بکات، ماددیەکان مەبەستیان ئەوەبوو چۆنێتی دروستبونی ژیان لە بەرچاوی خەڵکی بێنرخ بکەن و بڵێن یەکسەر ژیان لە ماددەی ڕەق و تەق و بەبێ دەستی خوایەك دروستبووە[١٢٧]، بەلام بەهەشت گیان، هەموو کاتێك زانست دەمکوتی ماددیەکان

---

[١٢٧] (الداروينية، عرض وتحليل)، يحيى محمد، ص١٣٥.

دەکات و جێگای دەستی خوای گەورە و پەروەردگارمان پیشان دەدا.

جا بەهەشت گیان ئەم بیرە هەڵەیە بەبێ ڕاستکردنەوە هەتا سەدەی پانزەیەمی زایینیی مایەوە، دواجار زاناکان قوڵی تاقیکردنەوەیان لێهەڵماڵی و ئەم تیۆرەشیان پوچەڵکردەوە:

أ/ پزیشکی بەناوبانگی ئیتالی (فراسیسکۆ ڕێدی) هەستا بە تاقیکردنەوەیەکی ئەزمونگەیی بۆ زانینی ڕاستیی و ناڕاستی مەسەلەکە، هات هەشت شووشەی هێنا و هەر یەکەیان هەندێك گۆشت و گۆشتی ماسی تێکرد و سەری چوار شووشەیانی بە شێوەیەك بەست، کە بە هیچ شێوەیەك هەوا نەچێتە ژوورەوە، سەری چوار شووشەکەی تری بە بەرەڵڵایی هێشتەوە، سەیری کرد ئەو شووشانەی سەر بەتاڵن و مێش و مەگەز ئەڕواتە ژوورەوە و ئەنیشێتەوە، پاش ماوەیەك بە هۆی مێش و مەگەزەوە کرم و زیندەوەری بچوکی هەڵهێنا، بەڵام چوار شووشە سەر قەپاتەکان تەنها گۆشتەکە گەنی و ئیتر هیچ جۆرە گیاندارێکی هەڵنەهێنا، بەمەدا بۆی دەرکەوت کە هەرگیز لە مردوو زیندوو پەیدا نابێ، بەڵکو ئەو مێروانەی لەسەر گۆشتی بۆگەنن یان ئاوی پیس، یان هەر زەلکاو و زۆنگاوێك بەدی

ئەکرێت، گەرای گیانداری ترن و هەرگیز لە ماددەی بێگیان گیاندار هەڵناهێنێ"[128].

ب/ زانایەکی بەرزی ئیتالی بە ناوی (لازارۆ سپالانزانی) کە خۆی هەر خەریکی لێکۆڵینەوەی زیندەوەرە وردەکان بوو، هەستا بە تاقیکردنەوەیەك لەسەر ڕاستی و ناڕاستی تیۆری (خۆرسك) پێنج قوتوی هێنا و گۆشتی کوڵاوی تێکردن سەری یەکێکیانی بەرەڵڵا کرد و سەری ئەو چوار قوتووەکەی زۆر بە چاکی بەست بە شێوەیەك کە هەوا نەچێتە ژوورەوە، لە دواییدا هێنای و هەر چوار قوتووەکەی گەرم کرد، یەکێکیان بۆ ماوەی نیو خولەك گەرم کرد و ئەوی تریان بۆ ماوەی یەك خولەك و یەکێکی تریان بۆ ماوەی خولەك و نیوێك چوارەم بۆ ماوەی دوو خولەك گەرم کرد، پاش دوو ڕۆژ سەیریکرد قوتووە سەر بەتاڵەکە جمەی دێ لە زیندەوەری میکرۆسکۆبی ئەوانی تریان وەك خۆی گۆشتەکە مابوو، تەنانەت بۆنیشی نەکرد و تێکیش نەچووبوو، بەمەدا بۆی دەرکەوت کە هەرگیز زیندەوەر لە ماددەی بێگیان دروست نابێ، بیرەوەری قوتومەنی (تلعیب) و هەڵگرتنی خواردەمەنی ناو قوتو بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لەسەر ئەم تاقیکردنەوەی (لازارۆ)وە بوو[129].

---

[128] (علم الحيوان العالم) للصفوف الجامعة الأولى، د. الراوي وجماعته، ص٣٢.

[129] (آراء في الحياة والتطور العضوي)، عزالدين تقو، ص١٧.

ج/ (د.عەبدولئیلاه صادق) دەڵێ: "بناغەی هەر ژیانێك دەبێ لە خانەیەکی زیندووەوە دەست پێبکات و هەرگیز خانەی زیندوو لە ماددەی بێگیان پەیدا نابێ، بەڵکو لە خانەی تری زیندووەوە دەستپێدەکات"[130].

د/ بیریار و پرۆفیسۆری هیندی (وحیدالدین خان) دەڵێ: "هەموو ئەو زانایانەی تا ئێستا هەوڵی زانینی یەکەم ڕواڵەتی پەیدابونی ژیانیان داوە تیۆرێکی ڕووتە و ناتوانین و نەیانتوانیوە لە تاقیکردنەوەیەکدا تیۆرەکانیان پیشان بدەن و بۆمان بسەلمێنن، بۆ نموونە نەیانتوانیوە لە کارگەیەکدا (لە تاقیکردنەوەیەکی ئەزمونگەییدا) بۆمانی دەرخەن چۆن ژیان لە ماددەی بێگیانەوە دروست دەبێ"[131].

هـ/ دواجار زانای بەناوبانگ و کیمیاگەری فەرەنسی (لویس پاستۆر) هات و بە تەواوی پشتی ئەم تیۆرە و هەموو تیۆرەکانی تر کە هەوڵدەدەن ژیان یەکسەر لە ماددەی بێگیانەوە بگوێزنەوە بۆ گیاندار شکاند و سەلماندنی کە هەرگیز زیندەوەر لە ماددە دروست نابێ، بەڵکو لە زیندەوەری وەك خۆی دروست دەبێ، پاستۆر سەلماندی کە هەوای سەر زەوی پڕیەتی لە میکرۆب و

---

[130] نظرات في علم الوراثة، ص١٥.

[131] الدين في مواجهة العلم، وحيدالدين خان، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: ظفر الاسلام خان، المختار الاسلامي، قاهرة، چاپی سێیەم، ١٩٧٤، ص١١.

گیانـداری میکرۆسـکۆبی هـەوا بـڵاوی دەکاتـەوە بەسـەر ڕووی زەویدا، جا هەر جێگایەك (بۆ ئەو میکرۆبانە) ڕێکەوت باش بێ بۆ ژیانیان و گەشەی تێدا بکەن و بژین (وەکو زەلکاو، گۆشتی گەنیو، شتی پیس و شوێنی پیس) وا جێگای خۆی دەکاتەوە و تێیـدا ئـەژی و گـەورە دەبـێ، تـا دواجـار ئێمـە وا ئـەزانین ئـەو زەلکاوە، یان ئەو شتە پیسە ئەو میکرۆبانەی هەڵهێناوە، پاستۆر بە دەیان تاقیکردنەوە و بەڵگەی زانستی هێناوەتەوە[١٣٢].

بەهەشـت: کاکەگیان، ئەگەر لەسەرشانت گران نییـە، یـەکێك لـەو تاقیکردنەوانەی پاستۆرم بۆ باس بکە.

نەورەسـی: بـە چـاوان بەهەشـت گیـان، لـە یـەکێك لـە دەیـان تاقیکردنەوەکانیـدا دەڵـێ[١٣٣]: "هەنـدێ شـۆربای گۆشـتین (گۆشاو)م هێناو لە ناو دوو قاپ (دەوری)دا دامنان، یەکێکیان سەرم بە تەواوی قەپات کرد و بەستم، تەنها کونێکم بۆ هێشتەوە بۆ هاتووچۆکردنی هەوا، ئەو کونەیش بە ناو بۆرییەکی پێچ پێچـی مـووداردا بـرد، کـە وەك داوێکـی لێهـاتبوو بـۆ گـرتنی میکرۆب و بە هیچ شێوەیەك میکرۆب لەو داوە ڕزگاری نەئەبوو

---

١٣٢_ ١٣٢ (علم الحیوان العالم) للصفوف الجامعة الأولي، د. الراوي وجماعته، ص٣٣.

ئەیگرت، پاش ماوەیەك سەیرم کرد شۆرباکە وەك خۆی ماوە و هیچ جۆرە میکرۆبێکی هەڵنەهێناوە[١٣٤].

بەهەشت: ئەی ئەو قاپەکەی تر؟

نەورەسی: ئەھ، دەڵێ قاپەکەی ترم هێنا و پەڕۆیەکم دا بەسەریا و بە شێوەیەك بەستم کە میکرۆب نەتوانێ بگاتە شۆرباکە، پاش ماوەیەك سەیرم کرد سەری پەڕۆکە پڕ بووە لە میکرۆب و بەڵام شۆرباکە هیچ میکرۆبی هەڵنەهێناوە.

بەهەشت: کاکە ئەوەتا لە ئەفسانەی کوردی خۆیشماندا دەڵێ[١٣٥]:

کـە شاخی بزنە بێن بکا لە خاك
لـێی پەیدا دەبێ مـارێکی ناپاك
زوو پەیـدا دەبێ لە خشتی نمدار
دوو پشکی چـزدار بە زەهر و ئازار

نەورەسـی: ئـەوەش خەڵتـەی فەلسـەفەی میسـالییە لـە کتێبـە ئیسلامییەکاندا.

بەهەشت: با بگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان.

نەورەسی: بەڵێ، باشە، جا پاش تاقیکردنەوەکانی پاستۆر تیۆری خۆرسك بە تەواوی شکا و نرخی نەما.

---

[١٣٤] .(آراء في الحياة والتطور العضوي)، عزالدين تقو، ص١٧.

[١٣٥] سەرچـاوەی ئـایین، مامۆسـتا مـەلا عەبدولکـەریمی مـوەڕیس، چـاپخانەی ئیرشاد، ١٧٢، ص٢٥٦

و/ (ڕۆسۆل چارلس ئارتست) پرۆفیسۆری ئەڵمانی و مامۆستای فرانکفۆرد دەڵـی: "تیـۆری زۆر و زەبەنـدە دانـراون بـۆ ئـەوەی بتوانن چۆنێتی پەیدابونی ژیانمان لە (بێگیان، نائۆرگانی)ەوە بۆ گیاندار ڕاڤە و شیتەڵ بکەن، هەندێ لەو توێژەرانە دەڵین: "لە (پرۆتۆجین)، یان لە (ڤایرۆس)، یان دەڵین: لە کۆبونەوەی هەندێ (مۆلیکیول)ی پرۆتینی، ژیان پەیدا بووە، هەندێ کەس وائەزانن ئەو کەلەبـەرەی وا لـە نێـوان بەستنی جیهـانی زینـدەوەران بـە جیهـانی ڕەقەمەنییـەوە ئـەو تیۆرانـە ئـەو کەلەبـەرەیان پـڕ کردووەتـەوە، بـەڵام ئـەوەی کـە ڕاسـتی بـێ و پێویستە چـاوی خۆمانی لێنەنوقێنین، ئەوەیە هەرچی هـەوڵ و تێکۆشانێك دراوە لـە ڕێـی زانـینی ئـەو مـاددە زینـدووەی لـە مـاددەی بێگیـان دروسـتبووبێ، هـەر هـەموویان تێکشـکان و سـەرنەکەوتن، تێکشکانێکی خراپیش"[١٣٦].

بەهەشت گیـان، بـا هـەموومان، هـەموو زاناکـان، هـەموو مـرۆڤ، هەموو بونەوەر پێکەوە بڵێین: خوای گەورە ڕاستی فەرمووە، کە فەرموویـــەتی: { يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥٓ إِنَّ ٱلَّذِينَ

---

[١٣٦] الله، تجلى في عصر العلم، دانـانی کۆمـەڵە لـە پرۆفیسـۆرانی ئـەوروپا و، وەرگێڕانـی د. دمـرداش عبدالمجيـد سـرحان، چـاپی سـێیەم، ١٩٦٨، دەزگـای فرانکلین، قاهرة، ص٧٧.

تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُوا۟ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُوا۟ لَهُۥ ۖ وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ }[137]، سورة (الحج : ٧٣ )

**ئەورەسی: لای ئێمەی موسڵمانە هەموو بونەوەر (گیاندار و بێگیان) خوا دروستیکردووە، ئیتر ئایا خوا هەر گیاندارێکی بە شێوەیەکی تایبەتی، یان بە یەکجاری، یان بە شێوەی گەشەکردن لە گیاندارێکی سادەوە بۆ ئەم گیاندارانەی ئێستا، گرنگ ئەوەیە ژیریی و زانستی ئێمە کورت بینە و ناتوانێ ئەو ڕێگایە ببڕێت، لەگەڵ ئەوەشدا خوا داوامان لێدەکات بەو زانستە کەمەوە کەمتەرخەمی نەکەین و بگەڕێین بە شوێن ئەو مەبەستە پیرۆزەدا، بەڵام بەبێ لە خۆبایی بون، بزانین خوا ئەفەرمووێ:**

{ وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا } ( الإسراء : ٨٥ )

---

[137] سورة (الحج : ٧٣ )، زیاترلە هەزار ساڵە زانیاریی مرۆڤ و مێش بە هەموو جۆرە دەرمانێکی کیمیاگەرییەوە شەڕ ئەکەن، کەچی مێش هەر ماوە.

ڕەحمەتی خوا لە شاعیری خواناس و هەقبێژ (مەولەوی) کە ئەفەرمووێ:

کەنارەی سەحرا نادیارییە
بینایی عقول ناو مروارییە
(ضیق النفس) یە هەناسە نایە
دانوشی پێ دەلیل (عرق النسا)یە
عرفان بەوانە کە حاصڵ دەوێ
بەو پێ نەو سارا چلۆن تەی دەوێ
چاك وایە خەیاڵ بێ تقریب نەکەین
مەعلومە تۆ، تۆی، ئێمەیچ خۆ ئێمەین

## نرخی مرۆڤ لای ماددیەکان:

بەهەشت: کاکەگیان، ئەزانی ئەم گەڕانەوەی مرۆڤە بۆ ئاژەڵی و تۆپەڵـە قـوڕێکی ڕووت، چـەند مـرۆڤ بێنـرخ دەکـات، وا ئـەزانم ئەوانیش مەبەستیان لە هاندانی داروینیزم تەنها ئەوەیە مرۆڤ لە هـەموو بـەرگێکی ڕەوشـت و ئـایین و ژیریـی و گیـان و دەروون ڕووت بکەنـەوە و وەك ئـامێرێکی مـاددی ڕووت لـە بـازاڕی ڕامیاریدا بیفرۆشن؟

نەورەسی: زۆر ڕاستە، جا بەهەشت گیان، بە ڕاستی ئەگەر مرۆڤ لە مرۆڤایـەتی بکرێـت و لـە ڕوانگەیـەکی ماددی ڕووتـەوە سـەیری بکرێـت، زۆر بێنرخـە. ڕەنگـە نرخەکـەی نەگاتـە (دینارێـك) لـەم کاتی شت گرانییەدا.

بەهەشت: دینارێك!! چۆن؟

نەورەسـی: ئەگـەر مرۆڤێـك بهێـنین و لـە تاقیگـە و کورەیـەکی کیمیاویـدا هـەموو توخمـەکانی لاشـەی جیابکەینـەوە، هـەر توخمێکی تەنی بە جیا دابنێین، بەم شێوەیە دەردەچێت:

١. بە ئەندازەی حەوت قاڵب سابون، ڕۆن (چەوری).

٢. بە ئەندازەی یەك پێنووس (قەڵەم) قورقوشم و کاربۆن.

٣. بە ئەندازەی (١٢٠) دەنکە شقارتە، فۆسفۆڕ.

٤. بە ئەندازەی یەك ژەم دەرمانی ڕەوانی، مەگنیسیۆم.

٥. بە ئەندازەی یەك دەنك بزمار، ئاسن.

٦. بە ئەندازەی قسڵاوکردنی کولانەیەکی مریشك، قسڵ.
٧. بـە ئەنـدازەی پاککردنـەوەی پێسـتی سـەگێك لـە کێچـی نـاو تیسکەکانی، گۆگرد.
٨. بە ئەندازەی (١٠) گاڵۆن ئاو.

سەرجەمی ئەمانە دەکاتە مرۆڤ و سفر بە دەستەوە[١٣٨]، ئەمە مرۆڤ لای ماددیەکان و لە ڕوانگەی داروینیزمییەوە، کە ئەم شتانە لە بازاڕ ئەیکڕیت بە دینارێك[١٣٩]، بەڵام مرۆڤ لای ئیسلام، زۆر بەڕێزە و هەموو کێشێکی ماددی لە ئاستیدا لاسەنگ دەردەچێت، خوا ئەفـــەرمووێ: { مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا بِغَيۡرِ نَفۡسٍ أَوۡ فَسَادٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا وَمَنۡ أَحۡيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحۡيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا } (المائدة : ٣٢ ) ، واتـە: هـەر کەسـێك مرۆڤێـك بکوژێـت، بێئـەوەی تۆڵـەی کوشـتنی کەسـێکی لەسـەر بێـت، یـان بـووبێ بـە هـۆی پشـێوی لەسـەر زەویـدا، وەك هـەموو مرۆڤایـەتیی کوشـتبێ وایـە، هـەر کەسێکیش مرۆڤێکی بێتاوان لـە مـردن ڕزگـار بکـات، وەك هـەموو ئادەمیزادانی بووژاندبێتەوە و لە مردن ڕزگاری کردبن وایە.

---

[١٣٨] (الانسان والداروينيـة)، محمـد صـالح کـريم خـان، چاپخانەی (الجمهوري)ی موسڵ، ١٩٧٦، ص٢٦٧، ئـەویش لـە کتـێبی (نظـرات في القـرآن)ی مامۆسـتا و پێشەوا موحەممەد غەزالی وەریگرتووە.

[١٣٩] لەو سەردەمەی کە ئەم کتێبەی تێدا نووسراوە (١٩٨١).

توخوا بەهەشت گیان، ئەم ڕێز و پلە و نرخەی مرۆڤ لە کوێ و مەن و پێوانەکەی ماددیەت لە کوێ؟ ئەم بێنرخی مرۆڤە بووە هۆی ئەوەی مرۆڤ مرۆڤایەتی لێ ون ببێ و ژیانێکی پڕ لە چەرمەسەری بباتە سەر، چ لە ڕۆژانی شەڕ و شۆڕ و چ لە ژیانی ئاشتیی و ئاسایشدا و پێشکەوتووترین ژیانی ئابوریدا"[١٤٠].

---

[١٤٠] انسانية الإنسان، رينيەدۆبۆ، مؤسسة الرسالة، بيروت ١٩٧٩، ص١٢-١٤، پێشەکییەکەی د. نبيل صبحي الطويل.

**کەلەبەرەکانی داروینیزم:**

**یەکەم/ داروینی تیۆرە**

**بەهەشت:** کاکەگیان، بە ڕاستی داروینی زۆر لە ماف خۆی زیاتریان داوەتێ، کراوەتە ڕاستی و سەلمێنراوێکی زانستی و لاوەکانی ئێمە وا ئەزانن هەر کەسە دژی داروینی بێ، دژی زانست و زانیارییە، هەر کەسە بڕوای بە داروینیزم نەبێ، کۆنەپەرستە و خاوەنی مێشکێکی بەردەنییە، بە کورتی پاڵەوانێتی داروینی وایلێکراوە کە مرۆڤ بێ داروینی ناژی، ئەوەتە نوسەری ماسۆنی (شلێمۆ مووشی = سلامە موشی) لە کتێبی (نظرية التطور وأصل الإنسان) چاپی پێنجەم، ساڵی ١٩٦٢، (ل٢١-٢٣)دا دێت، هەرچی زانستی سەدەی بیستەمە ئەیبەستێتەوە بە تیۆرەکەی داروینییەوە و دەڵێ: "نە فەیلەسوف لە مرۆڤ ئەگات و نە پزیشك دەبێ بە پزیشك و نە.. نە.. هەتا داروینی و داروینیزم نەبێ"، تەنانەت دەڵێ: "مامۆستای قوتابخانە ناتوانێ لە سروشتی قوتابییەکەی بگات، تا بەو شێوەیە گریمان نەکات و بیرنەکاتەوە کە گیانداریکی بچووکی لە بەردەستدایە، هەموو سروشتێکی مەیمونی تێدایە".
وا ئەو دروستکراوی دوژمنانی ئیسلامە و دەبێ وا بڵێ، ئەی چی ئەکەی لەگەڵ زۆڵە موسڵمانێکی لای خۆمان کە سەدان ساڵە خۆی و باوك و باپیری بارن بەسەر ئیسلامەوە و بە ناوی

کـوڕێتی پێغەمبـەرەوە ﷺ هەرچـی سـواڵ و سـەدەقەی ئـەم ئاواییانەی شارەزوور و سرۆچکە بوو کردیان، کەچی ئەیەوێ لە نامیلکەیەکی (٣٦) لاپەڕەییدا وتەی هەرچی زانا و ڕۆشنبیرانی جیهانە تێك بشکێنێ و بە خەیاڵی خۆشی تروسکایی ژیانی بۆ گەلی کورد دۆزیوەتـەوە، لـە (ل٢٢)دا دەڵی:"تیـۆری مامۆسـتا داروێـن مێشـکی مرۆڤـی لـە نـەفامی و نـەزانین و ئەفسـانە پـاککردەوە و بیری مرۆڤی لە وێڵـی و ئەشکەنجە ڕزگـارکرد و خسـتییە سـەر ڕێگـای ئـازادی و سەربەسـتی، ئـەمڕۆ گشـت لقەکانی زانستی تازە پشتگیری دەکات"، چونکە کردوویەتی بە ڕۆڵـەی مـەیمون و لـە کۆتی مرۆڤایـەتی ڕزگـاریکرد و کـردی بـە ئـاژەڵێکی ڕووت، ئەمانـە و نموونـەی ئـەم (باشـقە پرۆفیسـۆرانە) وەك خەرەنگەزە بە دوای ماددییەتەوە گیزەگیز دروست ئەکەن.

نەورەسی: خوشکێ گیان، نە ئەمانە و نە ئەوانە، هیچ لای ئیسلام نرخیـان نییـە، دەمێکیشـە ئیسـلام دەسـتی لـە زۆربـەی مـەلا و مەلازادە و شێخ و شێخزادە شۆریوە، بەهەشت گیان، ڕێکەوت نییە ئەگەر چاوێك ورد بکەینەوە بەسەر نەخشەی بڵاوبونەوەی چەردە دوکەڵی کوفر، سەیر دەکەین لە ماڵی شێخ و مەلا بەرز بۆتەوە، لە لایەکی تر با بە سەلامە موسا (کە ئێستا لە بەردەم دادگـای ڕاسـتیدایە و ئـەزانێ عـەلی کـوڕی کێیـە) و بـە هـەموو داروینیزم خـواز و داروینی بازێك ڕابگەیـەنم کە شوێنی خەیاڵ

پـلاو کـەوتوون و وا نییـە، دارویـنی (تیـۆرە) نـەك ڕاسـتی، یـان سەلمێنراوێکی زانستی.

**بەهەشت:** کورد دەڵی: هەردەوەنە بە دار دەبێ، هەر تیۆرە دەبێتە ڕاستییەکی زانستی بەڵگە نەویست، ئەی وا نییە ؟

**نەورەسی:** بەڵێ وایە، بەڵام مەرج نییە هەموو تیۆرێك، با بە جوانی بۆت باس بکەم، چاوەکەم، بۆچوونی زاناکان (هەموو زانایەك و هەموو بۆچوونیەك) دەبێتە سێ جۆر:

١. جـۆرە بۆچـوونێکی بەڵگـە نەویسـتە، زاناکـە وەك بـونی خـۆی لێی ڕوونە و ڕوون و ئاشکرایە لای هەموو زاناکـان، یـان زۆربـەی زاناکـانی ئـەو بەشـە، هـیچ زانایـەك ملـە ملـێ ناکـات وەك ئـاو لـە ئۆکسجین و هایدرۆجین پێکدێت، یان وەك خڕی زەوی، یـان وەك کێشکردنی زەوی. هەموو تەنێك بۆ چەقی زەوی ڕائەکێشیێ. یان وەك تەنێك کە دەکەوێتە خـوارەوە، لـە هـەر چرکەیەکدا (٣٢) پـێ خێراییەکـەی زیـاد دەکـات، ئەمانـە پێیـان ئـەوترێ چەسپێنراوەکان، یان سەلمێنراوەکانی زانستی.

٢. جـۆری دووەم، ئـەو جـۆرە بۆچـوونانەیە کـە نەگەیشـتوونەتە پلەی دڵنیایی هەموو زاناکان، بەڵکو جۆرێکە لـە خەملاندن، وەك شەپۆلەکانی بێتەل، چۆن شەپۆلێکن ؟ کاتێ ئەبیستی لە ڕادیۆ دەڵی: شەپۆلێکی ئەوەنـدە مەتری، شەپۆلی چۆن چۆنی ؟ یان کاتێ ئەبیستی دەڵێن: شەپۆلێکی تیشکی، ئەوەندە درێژ، کام

شەپۆلەیە؟ ئایا شەپۆلێکە وەك شەپۆلی ئاو ؟ یان شەپۆلێکە شەپۆلە دەنگ بە ناو هەوادا بڕوات ؟

یان شەپۆلێکە وەك جۆگەلەیەکی دەنگ و موگناتیسی کارەبایی بە تەوژمێکی بەر و دوای بەهێز و بێهێز لەسەر یەك ژێ ئەڕۆن، هەزاران بۆچوونی تر، یان وەك چۆنێتی پەیدابونی زەوی و ژیان و ...هتد، ئەمانە پێیان ئەوترێ تیۆر (نظرية)[١٤١].

٣. هەندێ زانا هەڵدەستن بە توێژینەوەیەکی زانستی، بەلاّم کۆمەڵێکی سیاسی ئەو زانایە بە سەروبەریەوە ئەکڕن و ئەمیش (ملی توێژینەوەکەی) بۆ دەچەرخێنێ و بە ئارەزووی ئەوان و لە قاڵبی سروشتی ئەواندا دایئەڕێژێ، وەك داروینی و فرۆیدی و مارکسی و درۆکایمی و...هتد، لەگەڵ جولەکەدا.

بەهەشت گیان، ئەو گۆڕانییەی لێرە لەم ولاّتە ئیسلامییە هەژارانەی ئێمە و ئەم فەریکە ڕۆشنبیرە تازە پەیدابووانە بە داروینیدا هەڵئەدەن ، نە لە ئەوروپا و (جێگای لەدایکبونی داروین) و نە لە ئەمریکاکان و نە لە هیچ دەوڵەتێکی پێشکەوتوودا نایڵێن و هەرگیز بلاّونەکراوەتەوە کە داروینی ڕاستییەکی زانستییە و بەڵگەنەویستە و ( هەموو زانستەکان پشتگیری دەکەن ) ئەگەر زانایەك زۆر دڵ پڕ و بە پەرۆش بێ بۆ

---

[١٤١] مع الله في السماء، د. احمد زكي، چاپی دار الهلال، ص١٦-١٧.

داروینـی و دڵسـۆزبێ ئـەو پـەڕی دەڵـی: "تیـۆرێکی زانسـتییە" تیۆر.

بەهەشت گیان، زانست (سوپاس بۆ خوا) بەرەوپێشەوە ئەڕوات و هەر ڕۆژەی لە گۆشەیەکەوە کارگوزاری ئادەمیزاد دەکات، خوا یارمـەتیی زاناکـان بـدات، بـەڵام ئـەوە بزانـە هـەرگیز لـە هـەموو سەرانسەری پێشکەوتنی زانستیدا (هەتا دونیا دونیایە) و هـەتا ژیـانی ئـەم بونـەوەرە مـاوە زانسـت (سـەلمێنراوێکی زانسـتی) نادۆزێتەوە کە جێگـای تاقە ئایـەتێك لـەم قورئانە پیرۆزەی ئێمـە لەق بکات، بەڵام وشەی (ڕاستیی و سەلمێنراوی زانستی) لە وشەی (تیۆر)، جیا بکەرەوە.

تیۆر بۆچوونی مرۆڤە، ڕەنگە ڕاست بکات، وابێ، ڕەنگـە وا نـەبێ و نـەیپێکابێ، بـەڵام سـەلمێنراوی زانسـتی دۆزینـەوەی نهێنیـی گەردونـە و جێگـای دەسـتی خـوا و وردەکـاری ئـەم بونـەوەرەمان پیشـان ئـەدا، هـەرگیز درۆ ناکـات و دژی قورئـانیش ناوەسـتێ، بەڵکو وردەکاری قورئانیشمان پیشـان ئـەدات، خۆزگـە بەهەشـت گیان ماوەی ئـەوەم ببوایە هەنـدێك لـەو ئایەتـە پیرۆزانـەی تـا ئـەم سـاڵانەی دوایـی مانایـان نەئـەزانرا و زانسـتی تـازە بـۆی ڕاڤەکردووین بۆم باس بکردیتایە، چونکە هەر ئەو کەسەی، هەر ئـەو دەسـتەی، هـەر ئـەو ژیرییـەی، هـەر ئـەو خوایـەی قورئـانی ناردۆتـە خـوارەوە، بونەوەریشـی دروسـتکردووە، ئـەوەی کـە

ئەمەویْ زیاتر بۆتی ڕۆشن بکەمەوە ئەوەیە کە مۆری زانستی لە زۆر شت دراوە و زانستی سەلمێنراویش ئاگای لێی نییە.

هەر بەو زانستە (ئۆپۆللۆ)ی ئەمریکی پێ ڕۆشتە سەر مانگ، هەر بەو زانستە (سیۆزی) ڕوسی گەشتەکانی ئاسمانی دەکات، سەلمێنراوە زانستییەکان لای هەموو زاناکان، زانای ئەمریکی و ڕوسی و چینی و ئیسلامیی... هتد، یەك زانستە و هەموویان وەك یەك بڕوایان پێیەتی، بەڵام ڕۆشنبیری و پارت پارتێنە و دروشمی ڕەنگاوڕەنگی بێ ناوەڕۆك هەر هەموویان جیایە و زانست جیایە.

داروینیش وەك تیۆرێك (تیۆرێکی کڕاو) بۆ هەموو ئادەمیزادانی سەر زەوی هەیە پەنجەی ڕەخنەی لێبەرز بکەنەوە، ڕەخنەی لێبگرن، دواجار با بزانین ئەو تیۆرە داروینییەی لای ئێمە کراوە بە ڕاستییەکی زانستی بەڵگەنەویست، با هەموو نووسەرە داروینیزمەکانی خۆمان بزانن کە داروین خۆی دەڵێ: (بیرەوەریی هەڵبژاردنی سروشتی) کەمتر لە سێ هەزار ملیۆن ساڵ نابێتە ڕاستییەکی زانستی[١٤٢].

---

[١٤٢] گۆڤاری (عالم الفکر) بەرگی ١١، ژمارە٤، مانگی مارت، ١٩٨١، ص٤١، وەزارەتی ڕاگەیاندنی کوێتی.

**دووەم/ مرۆڤ تەنها ماددە نییە**

**بەهەشت:** ئەی ناتوانین لە بواری ناسینی مرۆڤدا کەڵك لە داروینی (وەکو تیۆرێك و لێکۆڵینەوەیەك) وەربگرین ؟

**نەورەسی:** بەهەشت گیان، ئەوەی کە بریتی بێ لە توێژینەوە و ڕاڕایی زانستی لە ڕووی چۆنێتی پەیدابونی ژیان و مرۆڤەوە، خۆمان چاکتر لە داروینمان هەیە، هەروەك لە پێشەوە بۆم باس کردیت و هیچ پێویستیمان بە داروینی و داروینیزم نییە، ئەگەر سەیری وتەی زاناکانی خۆمان بکەین و بمانەوێ لێکۆڵینەوەیەکی فسیۆلۆجی و بایۆلۆجی و گەشەکردنی تازە دەست پێبکەین، لەسەر توێژینەوەکانی ئەوانەوە دەستپێبکەین زۆر سەرکەوتووتر ئەبین و مرۆڤمان لێ ون نابێ، چونکە بە ڕاستی ئەوروپا مرۆڤی لێ ون بووە بە گەواهیی خۆیان[١٤٣].

**بەهەشت:** ئاخر زانستی تازە لە ڕووی پشکنینی بەردەنیی و پۆلێنکردنی گیانداران و زانستی بۆماوە و...هتد، زۆر پێشکەوتووترە لەو کاتەی زاناکانی خۆمان و ڕەنگە ئەمان سەرکەوتووترین، خۆ هەردووکیان (زانایانی خۆمان و داروین)

---

[١٤٣] پرۆفیسۆری بەناوبانگ و هەڵگری خەڵاتی نۆبڵ (ئەلیکسیس کارێل) توێژینەوەیەکی قوڵی بەرامبەر مرۆڤ هەیە بە ناونیشانی (مرۆڤ، ئەو شتە نەناسراوە).

تیـۆرن و تیـۆرێکی لاوازیـش بـەڵام شـەقام و هەنگاوەکـەی ئـەمان گەورەترە.

تەورەسی: بەهەشت گیان، زانایانی ئەوروپی بە گشتی و داروین بازەکانیان بە تایبەتی، یەك هۆی سەرەکی ڕێگای چوونە لای مرۆڤیان لێون دەکات، ئەویش (گیان ـ روح)ە، کاتیٚ مرۆڤ لە گیان و توێژینـەوەی گیـانی جیاکرایـەوە هـەر بۆچـوونێك بـۆی بـڕۆی نەزۆك و ناتەواو دەردەچێت، چونکە هەر کاتێك زانایەکی ماددی زۆر وێـڵ دەبـیٚ بـە دوای مرۆڤـدا و دۆڵا و دۆڵـی زانیارییـەکان دەکـات و زۆر مانـدوو دەبـیٚ و تەمـەنێکی دوور و درێـژ بەسـەر دەبات لە توێژینەوە و یەکالاکردنەوەی تەرم و تەن و لاشەوە کە نزیکی مردنی دێت، خەریکە پشوویەك بدات و ئۆخەیەك بکات و ئـەو کاتـە دەڵـی: فلانـە شـت و فیسـارە شـتم لـە ئـادەمیزاددا دۆزیوەتـەوە، بـەڵام نهـێنی ژیـانم لـیٚ ون بـووە، ئـا لەمکاتـەدا کەمترین خوێنەرانی ئیسلام ئەدەنە قاقای پێکەنین و بۆی دەڵێن: برا نەمانگوت ناگەیتە ئامانج و نهێنی ژیان لای ئێمەیە و لای بەرنامەکەی ژیانی ئێمەیە:

{ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْـرِ رَبِّي } ( الإسراء : ٨٥ )

واتە: ئەی موحەممەد ﷺ پرسیارت لێدەکەن لە چۆنێتی گیان (ڕۆح) تۆیش پێیان بڵیٚ: ڕۆح یەکێکە لە نهێنییەکانی خوا و ڕێگای زانستی کەمی ئێوەی نییە.

بەهەشت: ئاخر کاکە هەر کەسە باوەڕی بە (ڕۆح) هەبێ، پێی دەڵێن: (ئایدیالی) ئێمەیش نامانەوێ ئیسلام ئایدیالی بێ؟!

نەورەسی: بەهەشت گیان، تۆ بتەوێ و نەتەوێ ئیسلام بەرنامەیەکی واقیعییە و جگە لە ئیسلام هەموو بەرنامەکانی تر ئایدیالین و لە هەموو ژیانیاندا قۆناغی کرداری (تطبیق)یان نەدیوە، بونی گیان (ڕوح) وەك دیاردەیەکی زانستی لێهاتووە و زانست پشتگیری دەکات، بۆ نموونەی پشتگیری:

١. لە ساڵی (١٨٤٦) لە یانەی کۆڕە زانستییەکانی ئەمریکا لە واشنتۆن، کۆڕێکی زانستی چەند ڕۆژەیان بەست و هەموو کەڵەزاناکانی ئەمریکا بەشدارییان تێداکرد و پشتگیری ڕۆح و ڕواڵەتی ڕۆحیان کرد[١٤٤].

٢. لە ساڵی (١٨٦٧) کۆڕی زانستی بەریتانی، نەك تەنها پشتگیریی بونی ڕۆحیان کرد، بەڵکو لیژنەیەکیان پێکهێنا بۆ سەرنجدانی دیاردەکانی ڕۆح لە لەندەن[١٤٥].

٣. هەر ئەم لیژنەیە لە (١٩٣٤/٥/٦) لەگەڵ ئەنجومەنی سەرکردایەتی زانکۆی لەندەن یەکەم کۆبونەوەی کرد بۆ توێژینەوە لە ڕۆح و زۆربەی مامۆستا بەرزەکانی زانکۆ بەشدارییان تێدا کرد، وەك: د.گای برون و پل پرت و فلود چڵ

---

[١٤٤] الله والعلم الحديث، عبدالرزاق نوفل، ص١٨٤-١٨٨.

[١٤٥] هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

و د. گود و چەند مامۆستایەکی تر، لە ئەنجامدا هەموویان بونی ڕۆحیان سەلماند[146].

٤. مامۆستا (هەن تیچەر) کە بەرزترین بڕوانامەی لە زانستەکانی سروشتگەری و کیمیا و ئەندازەی کارەبایی هەبوو، هەستا بە پێشکەشکردنی نامەیەکی زانکۆیی لە ژێر ناونیشانی (هێزی سەرووی هەستکراو) باسی بونی ڕاستەقینەی ڕوح و دیاردەکانی ڕوحی تێدا کردبوو، دوای لێکۆڵینەوە و چەندوچۆنکردنی لە لایەن ئەنجومەنی زانکۆی لەندەنەوە لە ساڵی (١٩٤٠)دا بڕوانامەی دکتۆرایان لە فەلسەفەدا پێبەخشی[147].

٥. ئەگەر ڕاستت ئەوێ بۆ سەلماندنی بون و نەبونی ڕۆح، پێویستمان بە گەواهی زانایانی (ماددی و ماددەزان) نییە، چونکە کاری ئەوان نییە، هەر کەسە خۆی نەختێك بیر لە خۆی و لاشە و تەنی خۆی بکاتەوە زۆر بە ئاسانی ڕۆح و دیاردەکانی ڕۆحی بۆ دەردەکەوێت، "پەرتووکی ( گەشتەکەم لە گومانەوە بۆ باوەڕ )[148]، و سەرباسی (لەش) بخوێنەرەوە"، ئەگەینا بەهەشت گیان وەرە سەیری تەرمی ئەو مرۆڤە مردووە بکە، پێش چەند

---

[146] هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

[147] هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

[148] ص١٩-٢٤.

چرکەیەك زیندوو بوو، لە ڕووی فسیۆلۆجییەوە هیچ ناتەواویی بەسەر ئەو ئەندامانەی لاشەکەدا نەهاتووە و هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا نەهاتووە، پێش چەند چرکەیەك زرت و زیندوو ئەیخوارد و ئەیخواردەوە ئەدوا و هەڵدەستا و دائەنیشت، چی بوو؟

ئەم زەلامە چی بەسەر هات؟ خۆ ئەوە لاشەکەیە وەك خۆی ماوە و هیچی کەم نەکردووە لە جیهانی ماددەدا ؟

بەڵام لە ڕاستیدا بەهەشت گیان گەورەترین شتی ونکردووە، گرنگترین شتی لە دەست چووە: ئەو شتە، زانست پێی دەڵی: (نهێنی ژیان) ئایین پێی دەڵێ: (ڕوح - گیان).

٦. ئەو زانایەی بە تەمایە گیانی مرۆڤ بە توێکردنەوە و لە ژێر وردبیندا بدۆزێتەوە هەڵەیە. نەك تەنها گیانی مرۆڤی بۆ نادۆزرێتەوە، ئەی دەروون (نفس)؟ ئەی ژیری و هێزی بیرەوەریی؟ تەرم و لاشە، قەوارە و قابلۆخی مرۆڤە، نەك مرۆڤەکە خۆی، بۆیە هەر هەوڵێك بدرێت بۆ ناسینی مرۆڤ لە جیهان و زانستی ماددیدا، هەوڵدانە بۆ ناسینی نیوەی مرۆڤ، نیوەکەی تری ماوە. دیسان هەر هەوڵێك بدرێت بۆ ناسینی مرۆڤ لە جیهانی گیاندا هەوڵدانە بۆ ناسینی نیوەی مرۆڤ نیوەکەی تری ماوە، چونکە مرۆڤ بە تەنها تەن، لاشە نییە، بەڵکو لاشە و گیان و ماددە و ئەودیوی ماددەیە، بەم خاڵانەی سەرەوەدا بۆمان

دەردەکەوت کە داروینی تیۆرێکە، تیۆرێکی ناتەواویش بۆ ناسینی کەمترین شت لە نیوەی مرۆڤ، بۆ ناسینی کەمتر لە چارەك و هەشت یەك و دەیەکیش، ئەگەر بە زۆر لە خۆکردن باوەڕمان بە داروینیزم هەبێ و وەك سەلمێنراوێکی زانستیش سەیری بکەین، داروینیزم بریتییە لە ناسینی خاڵێکی بچووك لەو ڕووبەڕە پان و پۆڕەی مرۆڤ و ناسینی مرۆڤی داگیرکردووە.

سێیەم: پرسیاری بێوەڵام

نەورەسی: بەهەشت گیان، کون و کەلەبەری داروینیزم زۆرە و بە کەس پینەپەڕۆ ناکرێت.

بەهەشت: وەك؟

نەورەسی: وەك هەزاران پرسیاری بێوەڵام، وەك شکستی هەر هەموو بەڵگەکانی داروینیزم، وەك دیت؛ وەك یەخە هەڵتەکاندنی زاناکان و هەزاران شتی تر.

بەهەشت: وایە و لە بیرمە و لە یادم نەچووە، بەڵام پرسیاری بێوەڵام نازانم؟!

نەورەسی: پرسیاری بێوەڵام لە داروینیدا زۆرن، هەموو بناغەی داروینی لەسەر دیواری بێبناغە و بێوەڵام دانراوە، بۆ نموونە (نەك بۆ هەڵدان) وا چەند نموونەیەکت بۆ باس دەکەم.

١. داروینیزم دەڵێ: "لە ئەنجامی هەڵکەندن و پشکنینی بەردەنییەکانی (حفریات) بۆمان دەردەکەوێت کە زیندەوەرە

نزمـەکان کـەمتر گەشـە ئەکـەن و بـەرەو پـێش ئـەڕۆن، بـەلاّم زیندەوەرە ژووروووەکان (الأحیاء العلیا) زۆر بە پەلە و بە تیژی گەشـە ئەکـەن و گۆڕانـدنیان بەسـەردا دێـت"، هـەروەها دەڵـی: "کەواتـە گەشـەکردنی زینـدەوەران بـە پێـی زۆر سـەرکەوتنیان لەسەر پەیژەی گەشەکردن گەشەکردنی گیانداران لە پاشەڕۆژدا بەهێزتر و تیژتر دەبێ لە چاو ڕۆژگاری ڕابردوودا"[149].

ئەم یاسای داروینیزمە هەزاران پرسیاری بێوەلاّم وێڵ و عەودالّ دەکات:

أ/ ئەگەر ڕاستە، خۆ مرۆڤ لوتکەی گەشەکردن و گەشەدارترین زینـدەوەران و گیاندارانـە، ئـەی بۆچـی گەشـەکردن لـە مرۆڤـدا وەستا و چی وەستاندی ؟

ب/ ئەگەر ئەم یاسایە ڕاست بوایە، دەبوایە هەر هەموو گیانداران لـە کـاروانی گەشـەکردن دوانەکەوتنایـە و هـەموویان بـەرەو گەشـەکردنی ڕۆژانـە بڕۆشتنایە کەچـی هـەر بـە وتـەی داروینـی خۆیان، تازە گەشەکردن وەستاو تەواو[150]، چی وەستاندی ؟

---

[149] نظریة التطور واصل الإنسان، شلێمۆ موشی، ص٦٢.

[150] گۆڤـاری (فـۆکس) ژمـارەی (ك/٢/٩٥٤) نووسـینەکانی زانـای بـەناوبانگی ڕوسی (ئۆپارین) لە کتێبی (عن الإنسان والعادیة الداروینیة) هادي المدرسي، ص٧٩.

ئایا ماددەکانی لەشی گیانداران و زیندەوەران کۆنفرانسیان بەست و ئەو بڕیارەیان دەرکرد ؟

یان هەر زیندەوەرەکان خۆیان گەشەکردنیان ناوێ و قایلن بەو بەشە، ( لە داروین بە زیاد بێ و کاری ڕاست بێ ).

٢. هەر کاتێك داروینیزم تێی ئەگیرێ و دەکەوێتە گیانەڵڵاوە، دەڵێ: ئەرێ وەڵڵا ئەوا ئەڵقەی ونبووی نێوان مرۆڤ و مەیموونمان دۆزییەوە، چەندجار هاواری دۆزینەوەی ئەو ئەڵقەیان لێبەرزبوویەوە و هیچ جارێکیش ڕاستیان نەکرد، جارێك لە (نیپاڵ) و جارێك لە (خوارووی ئەفریقا) و جارێکی تر لە (نەیجیریا) و جاری چوارەم و پێنجەم لە (ئەوروپا)، هەر هەموویان ڕاست نەبوو، ئەگەر ڕاستە و ئەو ئەڵقەیە دۆزرایەوە، ئەی بۆچی تا ئێستاش هەر بە پەرۆشەوە وێڵن بە شوێن ئەو ئەڵقە خەیاڵییەدا، لە ڕاستیدا ئەو ئەڵقەیە نەبووە بۆیە نادۆزرێتەوە، د.سوریال دەڵێت: "ئەگەر مێشکی خۆمان لە وێنە خەیاڵییەکانی وێنەکێشان پاکبکەینەوە و بە شێوەیەکی زانستیانە بگەڕێین بە دوای ئەڵقە ونبووەکان، سەیر دەکەین وەنەبێ ئەو ئەڵقەیە تەنها لە نێوان مرۆڤ و گیاندارەکانی تردا ون بووبێ، بەڵکو ئەو ئەڵقەیە لە نێوان گیاندارە تاکە خانەکان و گیاندارە فرەخانەکاندا، ونە، هەروەها ئەو ئەڵقەیە لە نێوان گیاندارە بێ بڕبڕەکان و بڕبڕەدارەکاندا ونە، ...هتد

لە نێوان ماسییەکان و وشکاوەکییەکاندا ونە، لە نێوان گیانداری خشۆك و باڵندە و خشۆك و شیردەرەکاندا ونە"[١٥١].

خۆ ئەگەر بێین و لە پرسیاری بێ وەڵامی داروینیزم بکۆڵینەوە زۆرمان ئەوێت.

بەهەشت: کاکەگیان، چۆن وا دەڵێی و وێنەی خەیاڵی وێنەکێشانی چییە. ئەی ئەو بەردەنی و ئێسك و کەللەسەرانەی نیاندەرتاڵ و شوێنەکانی تر چین ؟

ئایا بە ئەڵقەی نێوان مەیمون و مرۆڤ ناژمێررێن ؟

نەورەسی: نەخێر بەهەشت، جارێ کەللەی مرۆڤی نیاندەرتاڵ نابێتە ئەڵقەی نێوان مەیمون و مرۆڤ و هیچ زانایەکیش وای نەوتووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە کەللەسەری مرۆڤی نیاندەرتاڵ بە لای هەموو زاناکانەوە کەللەی سەری مرۆڤی خۆمانەیە و خاوەنەکەی نەخۆش بووە، ئەمەش نەك بە قسەی من، زانای جیۆلۆجی ڕوسی (أ.ب گازۆزوینا) لە کتێبی (سەرەتای زانستی جیۆلۆجی)دا دەڵێ: "کاتێ ئەم کەللە سەرە (مرۆڤی نیاندەرتاڵ) دۆزرایەوە، دەمەقاڵەیەکی زۆری دروستکرد لە ناو زاناکاندا،

---

[١٥١] (تصدع مذهب داروين والإثبات العلمي لعقيدة الخلق)، د. سوريال، لە کتێبی (عن الإنسان والمادية الداروينية، هادي المدرسي، ص١١١.

هەنـدێکیان لایـان وابـوو ئەمـە کەللەسـەری مرۆڤـی هاوچـەرخە (مرۆڤی خۆمانە) و کاتی خۆی تووشی نەخۆشی بووە[152] ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە، ڕەحمەتی خوا لـە گیـانی ئەو بیرتیژە ئیسلامییە (خاوەنی ڤلال) کە ئەفەرمووێ: "ئەو بـەردەنی و شوێنەوار و ئێسکە ڕزیوانەی داروینیزم کردوونـی بە بەڵگـەی ڕاسـتی تیۆرەکـەی، هـەر هـەموو ئـەو بەڵگانـە گومـانن و ناگەنـە پلـەی دڵنیـایی"، جـا نـازانم چـۆنێتی دروسـتکردنی (مرۆڤــی پلتداون)ت بیستووە، یان نا؟

**بەهەشت:** نەوەڵڵا.

**نەورەســی:** ئـەوە بریتیـی بـوو لـە قۆپییـەکی زانسـتی بـۆ بـە زۆر سەلماندنی داروینیزم: زانایەکی ئینگلیزیی دز (بەڵێ، زانـاش و ئەوروپییش و دزیش) کە ناوی (چارلز دۆسۆن) بوو، بۆ ئافەرین و ناودەرکردن لـە سـاڵی (١٩١١) کەللـە سـەرێکی مـرۆڤ و چەناگە (شەویلگە)ی مەیمونێکی کڕی و بە داودەرمانی هەمە جۆرە تێـی بەربوو، بۆ ئـەوەی ڕەنگەکەی بگۆڕێ وەك کەللەیـەکی زۆر کـۆنی لێبکات و بە بڕبەنگ و سمارتە هات بە وێزەیـدا، دواجـار هەسـتا بە دروستکردنی ئەو ئامێر و چەك و شتومەکەی مرۆڤـی کـۆن بە کاری دەهێنا و لە بەرد دروستی دەکردن، ڕۆشت لـە (پلتداون)ی

---

١٥٢ گۆڤاری (التربية الاسلامية)ی عیراق، ژمارە (١٠)ی ساڵی (١٩٦٩). هەروەها کتێبی (رؤية علمية للإيمان) محمد رشدي عبيد عقراوي، ص٣٩.

ناوچەی (سۆسگەن)ی ئینگلتەرا چاڵی هەڵکەند و لە قەراخ جادەیەك کردنی بە ژێر خاکەوە، پاش ماوەیەکی کەم لە بەرچاوی خەڵکی دەریهێنان و پێشکەشیکرد بە مۆزەخانەی بەریتانی، ئەم قۆپیە بەو شێوەیە مایەوە لەو مۆزەخانەدا، تا ساڵی (١٩٤٩) مۆزەخانەی بەریتانی، هەندێ زانای پسپۆڕی بانگکرد بۆ لێکۆڵینەوەی ئەو مرۆڤە (کەللەی مرۆڤ و چەناگەی مەیمون) پاش لێکۆڵینەوەیەکی دوور و درێژ بۆیان دەرکەوت کە ئەمە سیناریۆیە، بۆیە لە ساڵانی (١٩٥٣-١٩٥٤) مۆزەخانەی ناوبراو دوو پەخشنامەی دەرکرد و دزییەکەی مامۆستا (دۆسۆن)ی دەرخست، بڕیاری سڕینەوەی ناوی مرۆڤی (پلتدوان)ی لە لیستەی مرۆڤە کۆنەکان دەرکرد، لە پەخشنامەکەدا دەڵی: "زاناکان بۆیان دەرکەوت کە ئەو کەللەسەرە کەللەی مرۆڤی هاوچەرخە (خۆمانە) و ئەو چەناگەیەش چەناگەی مەیمونی (شەمپازی)یە، بۆیە کراوە و ڕنراوە بە بڕبەنگ و جێگای ڕنینی بڕبەنگەکە بە وردبین دیارییە، ئەو کەلاییە لە ددانەکانی ئەم مرۆڤە دروستبووە دەستکردە"[١٥٣]، ئەگەر پرسیار لە داروینبازەکان بکەیت و بڵێیت، ئا بەو شێوەیە

---

[١٥٣] (آراء في الحياة والتطور العضوي) عزالدين تقو، ص٥٥-٥٦.

و بـە دزی و گـزی و تـۆپزی ئەتانـەوێ تیۆرەکانتـان بسـەلمێنن؟ دەبێ وەڵامیان چی بێت ؟

٣. زانـای بـەناوبانگ و هـەڵگری خـەڵاتی (نـۆبڵ) لـە زانسـتدا، مامۆستا (رینیە دۆ بۆ) دەڵی: "پێش (٣٠ هەزار ساڵ) لەمەوبەر مرۆڤـی (گرۆماگنون) لە زۆربـەی ئـەورووپادا ژیـاوە و ژیانیـان بە ڕاوچێتیی بەسـەر بردووە، کەچی لـە هـەموو شتێکدا وەك ئێمـە وابون و هەموو شتومەکەکانیان بە ئەندازەی دەست و ناو لەپی ئێمە بون"[١٥٤].

٤. جۆرە ماسییەك هەیە پێی دەڵێن (کرۆسۆپریگای) لایان وابوو ئەم ماسییانە و هەموو هاوشێوەکانی پێش (پەنجا ملیۆن) ساڵ قڕبووە و هیچیان نەماوە، کەچی لـە سـاڵی (١٩٣٨)دا لـە کـەنار دەریا و لە ڕۆژهەڵاتی خوارووی ئەفریقا ماسییەکیان لەو جۆرە ڕاوکرد، هەوەها لە ساڵی (١٩٥٢) ماسییەکی تریـان ڕاوکـرد، ئـەو دوو ماسییە کە بە پۆلێنکردن و تەمەن دانانی داروینی تەمەنی ئەو چەشنە ماسییە دوو سەد ملیۆن ساڵە و پێش پەنجا ملیۆن سـاڵە بنـەبڕ بـون و نـەماون، زاناکـان سـەیریان کـرد بـە هـیچ شێوەیەك نەشێوەی دەرەوەی و نە شێوەی ناوەوەی هیچ جۆرە

---

[١٥٤] (انسـانیة الانسـان) رینیـە دۆ بـۆ، وەرگێڕانـی د. نبیـل صـبحي الطویـل، مؤسسة الرسالة، بیروت، چاپی یەکەم، ١٩٧٩، ص٧١.

گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووە[155]، ئەگەر بە داروینی بڵێین ئەی ئەم پرسیارەمان (ئەم ماسییە تا ئێستا لە کوێ خۆی شاردبووەوە؟) پەنجا ملیۆن ساڵ بە دەم خۆشە ؟ دەبێ چی بفەرمووێ!!!

چوارەم/ مرۆڤ مەیمون نییە و نەبووە

بەهەشت: کاکەگیان، چەند کتێبی داروین (خۆی)م دیبێ، یان وتەی کە لە کتێبی تردا بڵاوکرابێتەوە؛ نەمبیستووە و نەمدیوە لە نووسینێکی داروینیدا وتبێتی (مرۆڤ لە مەیمون بووە، یان لە مەیموونەوە گەشەی کردووە)، ئیتر نازانم ئەم وتەیە چۆن دروستبوو؟ ڕاستی و ناڕاستی تا کوێ بڕ دەکات ؟

نەورەسی: بەهەشت گیان، لە ڕاستیدا داروین هەرگیز نەیوتووە مرۆڤ لە مەیمون گەشەی کردووە، بەڵکو دەڵێ: مرۆڤ و مەیمون لە یەك باپیرە پەیدا بون، بەڵام کاتێ کتێبەکانی داروین لە ئەوروپا بڵاوکرایەوە و داروین هەوڵی نزیککردنی مەیمونی لە مرۆڤ دابوو، وێنەکێشە کاریکاتێرییەکان بۆ پێکەنین و زۆر جاریش بۆ گاڵتەکردن بە تیۆرەکە، وێنەی مەیمونێکیان ئەکرد بە کوڕم و قسەی لەگەڵ مرۆڤێکدا ئەکرد، یان نەخشەی بنەڕەتی مرۆڤیان ئەکرد و لە مەیمونەوە دەستیان پێئەکرد، ئەم وێنانە بووە هۆی وتنی (مەیمون باوکی مرۆڤە)[156].

---

[155] (آراء في الحياة والتطور العضوي) عزالدين تقو، ص٩٢.

[156] قصة الإيمان، بين فلسفة والعلم والقرآن، تديم الجسر، ص١٨٩.

ڕاسـتی و ناڕاسـتی تـا کـوێ بڕدەکـات، ئەمـە کەلێنێکـە و کەلەبەرێکی گەورەیە و داروین بۆی پڕ ناکرێتەوە.

بەهەشـت گیـان، لـە بیرتـە لـە سـەرەتای باسـەکەماندا و لـە بەرپەرچدانەوەی بەڵگەکانی داروینیدا، هەندێ باسـی جیاوازیی مەیمون و مرۆڤم بۆ کردی و ئێستاش هەندێکی تر لەو هەموو جیاوازییە گەورانەی نێوان مرۆڤ و مەیمونت بۆ باس ئەکەم، کە ئەگاتە ڕادەی جیاوازیی نێوان مرۆڤ و هەندێ گیانداری تر.

١. ئـەوەبوو باسـی جیـاوازیی فراوانـی نێـوان کەللەسـەری مـرۆڤ لەگـەڵ مـەیمون و بڕبـڕەی پشـتی و ڕۆشـتنی مـرۆڤ بـە ( قـنج و قیتی) و فراوانیی مۆخدان و ماسولکە و شەویلگە و پلەی بیر و زانستی مرۆڤ لە چاو مەیموندا، ئەمانەم هەموو بۆ باس کردیـت، کە ئەمانە بەسە بۆ جیاوازیی نێوان مرۆڤ و مەیمون.

٢. بـەڵام سـەرباری ئەوانـە، دەسـتەکانی مـرۆڤ کورتن و هـاوکێش نین لەگەڵ قاچەکانیدا، وەك لە مەیموندا هاوکێشن.

٣. ئێسـکی حـەوز لـە مرۆڤدا پانـە، کەچی لـە مەیموندا درێـژ و تەسکۆڵەیە.

٤. خۆ چەناگە پێویست بە هیچ پلارێك ناکات.

٥. شێوەی گشتی دەم و چاو.

٦. شێوەی ژیانی مرۆڤ لەگەڵ مەیمون.

٧. وەستانی مرۆڤ لەسەر پێ( تەنانەت سەر پێ، یان پاژنە پێ) بە ئارەزووی خۆی بەبێ هیچ ماندوبونێك.

٨. باری ورگ و گەدە و ڕیخۆڵە (هەناو) بە گشتی لە مرۆڤدا لەبارە بۆ وەستاندن بە پێوە، کەچی لە مەیموندا لەبارە بۆ وەستاندنی لەسەر چوار پێ.

٩. مرۆڤ بە ڕاکشانەوە پاڵ دەکەوێت و ئەخەوێ، مەیمون بە پێوە ئەخەوێ.

١٠. تێکڕایی باڵغبونی جنسیی مرۆڤ (١٣-١٥) ساڵە، بەڵام تێکڕایی باڵغبونی مەیمون (٢-٤) ساڵە.

١١. خۆ، فێربونی زمان و گفتوگۆکردنی مرۆڤ (چەند مرۆڤێکی کاس و گێژیش بێت) لەگەڵ مەیموندا بەراورد ناکرێت.

١٢. مرۆڤ گیاندارێکی گۆشتخۆر و گژوگیاخۆرە، بەڵام مەیمون تەنها گیا و میوەخۆرە.

١٣. گۆشەی دەم و چاوی مرۆڤ نزیکەی (٨٠-٨٥) پلە دەبێ، کەچی لە مەیمون بگرە زۆربەی گیاندارانی تردا زیاتر لە (٢٦)پلە نابێ.

١٤. کۆرپـەی مـەیمون پێویسـتی بـە پـەروەردە و لەلـەیی نییـە، چونکە ئاژەڵی هەڵکەوتووە و چوار پێیە، بەڵام کۆرپەی مرۆڤ بێ لەلەیی نابێ[١٥٧].

١٥. ئـەم جیاوازییانـەی نێـوان مـرۆڤ و مـەیمون ئەگـەر شـیتەڵ بکـەین و لەسـەری بـڕۆین زۆری ئـەوێت، بـۆ نموونـە تـەنها جیاوازیی نێوان دەسی مرۆڤ و مەیمون:

أ/ دەستی مرۆڤ هەموو کارێکی هونەری و شتگرتن و کارکردنی پێدەکرێت، بەڵام دەستی مەیمون وا نییە.

ب/ پەنجە گەورەی دەستی مـرۆڤ ئەجوڵێ، نزیکە لە پەنجەکانی تریـەوە، بـەڵام پەنجـە گـەورەی دەسـتی مـەیمون لـە باسـکیەوە نزیکترە هەتا پەنجەکانی.

ج/ جموجـوڵی دەسـتی مـرۆڤ بـۆ پێشـەوەیە، بـەڵام جموجـوڵی دەستی مەیمون بۆ تەنیشتە.

د/ ماسـولکەی باسـکی مـەیمون پـان و پـرش و بـڵاوە، بـەڵام ماسولکەی دەستی مرۆڤ جووتەنییە.

هـ/ پەلی دەستی مەیمون زیاتر لە (٩٠)پلە ناکرێتەوە، بەڵام پـەلی مرۆڤ (١٨٠) پلە ئەکرێتەوە[١٥٨].

---

[١٥٧] (الاسلام ونظرية داروين) محمد احمد باشميل، ص٦٢-٦٣، چاپی دووەم. هەروەها (الدين والعلم) احمد عزت پاشا، الترك. (الداروينية عرض وتحليل) يحيى محمد، ص٢٢٤-٢٢٩.

و/ بەهەشت گیان، کەلێنەکە زۆر گەورەیە و بەسەر و سەکوتەوە تێیکەوتوون، خۆشیان زۆر چاك ئەزانن و ددانی پێدا ئەنێن.

**بەهەشت:** کوا ؟

**نەورەسی:** تەماشای کتێبی (نظرية التطور وأصل الإنسان)ی شلێمۆ موشیێ بکە لە (ل١١٥)دا دەڵێ: "بە ڕاستی لە مەسەلەی گەشەکردنی دەستی مرۆڤدا (یان هەموو دەستەکاندا) سەرسامین و نازانین چۆن گەشەیان کردووە !؟

چونکە تا ئێستا نەمانتوانیوە دەستێکی ناتەواو پیشانی خەڵکی بدەین، کە بەرەو گەشەکردن بڕوات، یان دەستێك سیێ پەنجە، یان چوار پەنجەی هەبێ"[١٥٩،١١٧]، بەهەشت گیان، بە ڕاستی تا ئێستا بەردەنی هیچ گیاندارێکی خاوەن دەست نەدۆزراوەتەوە کە لە پێنج پەنجە کەمتری بووبێ.

ز/ ڕۆژنامەی (الجمهوريه)ی عێراقی لە ژمارەی (٢٢٧٩)ی ڕۆژی (١٩٧٥/٣/١٢)دا نووسیویەتی: "پەنجەکانی دۆشاومژە و پەنجەگەورەی مرۆڤ، تەنانەت لەو مەیمونانەشدا کە زۆر نزیکن لە مرۆڤەوە، پەنجەگەورەی زۆر کورتە و ناگاتەوە بە پەنجەی دۆشاومژە، کە ئەو کارەش زۆر یارمەتی مرۆڤی داوە بۆ گرتنی شتومەك و ئامێری بەرگریکردن لە خۆی بە ئاسانی، کە ئەمەش

---

[١٥٨] الداروينية عرض وتحليل، يحيى محمد، ص٢٢٤-٢٢٥.

[١٥٩] عن الإنسان والمادية الداروينية، هادي المدرسي، ص١١٢-١١٣.

بەڵگەیە بۆ بە درۆکەوتنەوەی ئەوانەی لایان وایە مرۆڤ و مەیمون لە یەك وەچە پەیدا بون".

١٦. با کەمێك گوێ لە زاناکانیش بگرین لەو بارەوە:

أ/ زانای ئەڵمانی (ڤێرسۆ) دەڵـی: "کاتێك سەیر دەکەین هەندێ مـرۆڤ هاوبەشـی مـەیمون ئەکـەن لـە هەنـدێ شـتدا، وەك بـەرزی چەناگە و پانی لووت، ئەمانە هەرگیز نابنە بەڵگـەی گەشـەکردنی مرۆڤ لـە مەیمون، چونکە جیاوازیی نێوان مرۆڤ و مـەیمون زۆر روونە و ئەو بەڵگانە پێویستیان بە بەڵگەی بەهێزتر هەیە"[١٦٠].

ب/ زانـای بـەناوبانگ (دۆکاترخـاج) دەڵـی: "لـە سەرانسـەری مێژوودا خزمایەتیی لە نێوان مرۆڤ و مەیموندا نەبووە، چونکە بەردەنی مرۆڤی چەرخی چوارەمین، هەروەك مرۆڤی ئێستا وایـە، کە ئەبوایە لە باپیرە مەیمونەکانییەوە نزیکتر بووایـە، وەك گومـان ئەکەن، هەروەها دەڵی: "بیروباوەڕی پەیـدابونی مـرۆڤ لـە مـەیمون ئێمە ناتوانین بە بیروباوەڕێکی زانستیی دابنێین"[١٦١].

ج/ مامۆستا (فـەرخۆ)ی پرۆفیسـۆری زینـدەوەرزانی دەڵـی: "بـە ڕاستی بۆمان دەرکەوتووە کە جیاوازییەکی گەورە هەیە لە نێوان مەیمون و مرۆڤدا، لەبەرئەوە هـەرگیز بۆمان نییـە بڵێین مـرۆڤ لە

---

[١٦٠] الداروينية عرض وتحليل، يحيى محمد، ص٢٢٧.

[١٦١] الإنسان والداروينية، محمد صالح كريم خان، ص١٢٩-١٣٠.

مەیمون، یان لە هیچ چوار پێیەك گەشەی کردووە"[١٦٢]، بۆچوونی زۆر و زەبەند دژی مەیمونبونی مرۆڤ هەیە.

١٧. داروینیزم ئەیەوێ جیاوازی نێوان مرۆڤ و مەیمون بگەڕێنێتەوە بۆ گەورە و بچووکی مۆخی مرۆڤ کە ئەمیش وا نییە، زۆر و کەمی مۆخ هیچ پەیوەندیی بە زیرەکیی و تەوەزەلی، یان کەم ژیریی کەسەوە نییە، ئایا ئەزانی بچووکترین مۆخی مرۆڤ کە ئێستا دەستی زانایان کەوتبێ مۆخی کەللەسەری (دانتی)[١٦٣] ئیتالی بووە[١٦٤]، کە بلیمەتترین ئەدیبانی ئیتالی بوو، ئەمە لە لایەك و لە لایەکی ترەوە، زاناکان هەموو لەسەر ئەو بۆچوونەن کە مۆخی مرۆڤی نیاندەرتاڵ زۆرتر و قەوارەدارتر بووە لە مرۆڤی ئێستا، کەچی مرۆڤی ئێستا لە کوێ و مرۆڤی ئەوسا لە کوێ!!؟

بەهەشت گیان، گەڕانەوەی هۆی زیرەکی مرۆڤ بۆ قەوارەی مۆخ ناتەواوە، خۆ مۆخی(فیل) سێ ئەوەندەی مۆخی مرۆڤە، ئەبوایە فیل جڵەو بە دەستی سەر زەوی و ژێری زەوی بوایە[١٦٥].

---

[١٦٢] الاسلام ونظرية التطور، محمد احمد باشميل، ص٥٣.

[١٦٣] گەورەترین شاعیری ئیتالییە و بە یەکێك لە ئەدیبە ناودارەکانی جیهان دەژمێردرێت.

[١٦٤] بين العلم والدين، عبدالرزاق نوفل، ص٩٠-٩١.

[١٦٥] الداروينية عرض وتحليل، يحيى محمد، ص٢٤٧.

**پێنجەم/ داروین لە ڕووی باوەڕەوە**

**بەهەشت:** کاکەگیان، من وانازانم داروین خۆی بێباوەڕ بووبێ، یان بانگی خەڵکی بۆ بێباوەڕی کردبێ، جا نازانم تۆ بۆچوونت چۆنە؟ ئایا بە باوەڕداری ئەزانی، یان بێباوەڕ ؟

**نەورەسی:** باوەڕبون و باوەڕنەبونی داروین (خۆی) جێگای لێکۆڵینەوەی زاناکانی خۆمانە، هەندێ لە زاناکان بەرگرییەکی زۆر لە باوەڕی داروین ئەکەن و لایان وای داروین باوەڕدار (موئمین) بووە، لەوانە: (ندیم الجسر)[١٦٦]، (هادی المدرسی)[١٦٧] گەلێکی تر لە زاناکانی خۆمان و زاناکانی ئەوروپا، بەڵام هەندێکی تریان لەسەر ئەو بۆچونەن کە داروین باوەڕی نەبووە (بێباوەڕ بووە)[١٦٨].

**بەهەشت:** ئەی تۆ خۆت چۆنی لێتێئەگەیت و بۆچوونی خۆت چۆنە ؟

**نەورەسی:** من وای تێدەگەم لە سەرەتای توێژینەوەی تیۆرەکەیەوە باوەڕدار بووبێ، دواجار بێباوەڕی بەسەریدا زاڵ بووبێ، یان ڕاستر بڵێم، من بە دووڕوو (مونافیق)ی ئەزانم.

---

[١٦٦] (قصة الإيمان بين الفلسفة والعلم والقرآن) ص١٨٧.

[١٦٧] (عن الانسان والمادية الداروينية) ص١٦٥.

[١٦٨] (الانسان بين المادية والاسلام)، پەراوێزی لاپەڕە (٢١)

بەهەشـت: دوورِوو ؟ کاکـە چۆن دەبـێ زانـای ڕاسـتەقینە دوورِوو بێ؟

ئەورەسی: جا کێ وتوویەتی داروین زانای ڕاستەقینەیە، زانای ڕاستەقینە{ إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْ } فاطر : ٢٨ یە، ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە لە لێکۆڵینەوەی باوەڕی داروین بە ئاسانی دوورِوویی دەردەکەوێت.

بەهەشت گیان، ئەگەر مەلایەك، یان قەشەیەك، بە داروین بڵێ: درۆزنە و دوورِووە، شتێکی گومان لێکراوە، بەڵام بڕۆ سەیری کتێبی (داروین) بکە، لە نووسینی (ئەندریە کریسۆن) و وەرگێڕانی بۆ عەرەبی (سلمی زیاد) بزانە کە (کریسۆن) نە مەلا و نە قەشەیە و ئەورووپیی و هاوخوانی داروینە، کەچی لەو کتێبەدا و لە (ل٦)دا دەڵێ: "داروین هەر لە منداڵییەوە هەتا گەورەبون و مردنی دوو دیاردەی ئاشکرای هەبوو.

یەکەم: گێلێتییەکی زۆر زەق.

دووەم: درۆزنی، داروین خۆی زۆر درۆزن بووە و زۆر خۆش بڕوا بوو، هەرکەس هەرچی بوتایە بڕوای پێئەکرد، خۆ گێلێتییەکەی وابوو نەیئەهێشت لە قوتابخانە بخوێنێ و زۆر پەست بوو لە وانەکانی قوتابخانەی، بە تایبەتی وانەی توێکاری (ترشیح) لە

هەموویان زیاتر پەسنتی ئەکرد"[169]، کە ئەم کتێبەی کریسۆن، کتێبی دۆستی داروین و داروینیزمە و هەوڵی ئەوە ئەدا داروین بخاتە ڕیزی کەڵە زاناکانی جیهانی، کەچی بەو شێوە ڕاستییە باسی دەکات، ئەمە بۆ درۆزنیی داروین، خۆ بۆ دووڕوویی:

١. تەماشا دەکەین لە لایەکەوە خۆی بە باوەڕدار پیشان ئەدات و باوەڕی تەواوی بە خوا و دروستکەری بونەوەر و ژیان و مرۆڤ هەیە:

أ/ پاش ڕەشکردنەوەی (٧٧١) لاپەڕە لەسەر داروینیزمی و پەیدابون و گەشەکردن، ئەمجا هەر خۆی خوێنەرەکانی ئەخاتە دوودڵی لە توێژینەوەکەی لە لایەکەوە بڕواهێنانێکی قووڵ بە خوا لە لایەکی ترەوە، تەماشای کتێبی (أصل الأنواع)[170] بکە دەڵێ: "ولذلك فلا بدلی أن استنتج من المقارنة والتحليل بالمثل انه من المحتمل أن يكون كل الكائنات العضوية التي عاشت فوق هذه الأرض قد انحدرت على شكل أصلي بدائي نفخ الله فيه الحياة أول مرة"

واتە: کەواتە پێویستە لە ئەنجامی هەڵسەنگاندن و شیتەڵکردنەوە، بڵێم، لەوانەیە هەموو ئەو زیندەوەرانەی جیابونەتەوە و یەکەمجار خوا فووی ژیانی کردوون بە بەردا.

---

[169] سلسلة اعلام الفكر العالمي، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت.

[170] وەرگێڕانی (اسماعیل مظهر) یان ڕاستتر بڵێین (د. محمد یوسف حسن).

ب/ لە نامەیەکی داروینندا کە بۆ هاوڕێیەکی نووسیبووی، دەڵی: "پێویستە ئاگادارت بکەمەوە، وەك مەردێکی بەشەرەف، کە من گەیشتوومەتە ئەوپەڕی کافری و لەخوا یاخیبون و بێباوەڕ، چونکە بیروباوەڕی (دروستبونی سەربەخۆیی گیانداران)م هەڵوەشاندووەتەوە، ڕەنگە تۆیش بێزم لێبکەیتەوە و بە سووکی سەیرم بکەیت"[171].

ج/ داروین دەڵی: "ئەستەمە ژیری، چاوی خۆی کوێر بکات لەم گەردونە پان و پۆڕە و ئەو نیشانە ئاشکرایانەی خوا و ئەو گیان و دەروونە گۆیا و بیردارانە، لە ڕێکەوتی کوێر دروستبووبێ؛ چونکە کوێر ناتوانێ یاسا دروست بکات، کە ئەمەش بە لای منەوە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر بونی خوا"[172].

٢. لە لایەکی ترەوە دەڵێ: "دانانی دەسەڵاتی خوا لەگەڵ تیۆری پەیدابون و گەشەکردن، وەك دانانی هێزێکی ئەودیوی سروشت لە کارێکی میکانیکی ڕووت، وایە".

---

[171] نظرية الطور بين العلم والدين، علي احمد الشحات، مؤسسة الخانجي، القاهرة، ص٢٧.

[172] عن الإنسان و المادية الداروينية، هادي مدرسي، ص١٦٥. (قصة الإيمان) نديم الجسر، ص١٨٨.

ئەمانە و نموونەی ئەمانە، بریتین لە بۆچوونی داروین، کێ تێئەگات دەڵێ چی؟ باوەڕدارە، یان بێباوەڕ!! هەر خۆی ئەزانێ کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دڕاوە ؟!!

ئەمە لە ڕووی داروین (خۆی) و باوەڕداری و بێباوەڕییەوە، من ئەوەندەی لێئەزانم.

بەهەشت: کاکەگیان، وا بزانم ئەگەر داروینیزم لە زوڕناژەنانی زایۆنی جیهانی پاك بكرێتەوە، هەرگیز نابێـە هۆی بێباوەڕ و گومڕایی؟ جا نازانم تۆ بۆچوونت چۆنە ؟

نەورەس: بەهەشت گیان، ئەگەر داروینی بریتیبێ لە توێژینەوەیەکی زانستیی ڕووت و (دیۆجامە)ی ڕاوکردنی بیروباوەڕ نەبێ، هیچ بەربەرەکانێ لەگەڵ ئایین ناکات، ئەمە وەنەبێ من بمەوێ بەرامبەر بە داروینی نەرمی بنوێنم، بەڵکو واقیع وایە و خۆیان زیاتر لە ئێمە ئەیڵێن، بۆ نموونە:

١. داروین خۆی، لە کتێبی (أصل الأنواع) و لە (ل٧٦٧)دا دەڵێ: "من ئەو بۆچوون و هۆیانە بە ڕاست نازانم کە ئەیانەوێ و وا ئەزانن ئەو بیروباوەڕانەی لەم کتێبە (أصل الأنواع)دا هەیە بەربەرەکانێ لەگەڵ هەستی ئایینی هیچ کەسدا بکات".

٢. توماس هیکسلی، کە بە یەکێکی گەورە دائەنرێت لە ڕەوڕەوەی پێشخستن و پشتگیریی داروینیزمدا، لەگەڵ داروین بازییەکەیدا لە کتێبی (جێگای مرۆڤ لە سروشتدا) دەڵێ:

"بیروباوەڕی خواویستی (خواپەرستی) لەگەڵ زانست، هەرگیز لێك جیانابنەوە، ئەو باوەڕ و زانستە هەمووکات هاوپەیمانن و بە یەك ئەگەن، بەیەك ئەگەن لە هەموو تاقیکردنەوەیەکدا، لە هەر توێژینەوەیەك زاناکان لە ناسینی نهێنیی گەردوندا بۆی بگەڕێن"[173].

٣. نووسەری داروینی (جۆرج حەننا) لە کتێبی (قصة الأنسان) و(ل٩-١٠)دا دەڵێ: "بە هیچ شێوەیەك تیۆری داروینی مانای نەبونی خوا نابەخشێت".

ئەمانە و دەیان نموونەی تر کە ئەوان (خۆیان بە دەمی خۆیان) پاکانە بۆ داروین ئەکەن، کە دژی ئایین و خوا و هەستی ئایینی نییە.

شەشەم/ گورگانە شەوێی داروینی

بەهەشت: قسەی خۆمان بێت کاکە، زۆر شیتەڵکردن و وەڵامی پرسیاری داروینیزم هەیە لە قسەی بەرئاگردان و ڕازی دێو و درنج دەکات، زیاتر لەوەی لە تیۆرێکی زانستیی بکات، ئەو هەموو با و بڕەی تێیکراوە، وانییە؟

نەورەسی: زۆر ڕاستە خوشکەکەم.

---

[173] گۆڤاری (العربي) کوێتی، ژمارە (٢٠٤)، ساڵی (١٩٧٥). کتێبی (رؤية علمية للأيمان) محمد رشدی ئاکرەیی، ص٤٠.

**بەهەشت:** کورە زۆرجار ئەتەوێ پرسیارێك لە داروین بکەیت و چاوەڕێی وەڵامێکی زانستییانە دەکەیت، کەچی وەڵامەکەی لە گورگانە شەوێی کۆڕپە خەواندنی کوردەواری جاران دەچێت، بۆ نموونە: کاتێ ئەتەوێ پرسیار لە داروین بکەیت و بڵێی: چۆن مرۆڤ لە مەیمون جیابوویەوە و هۆی ئەو لێکپچڕانە چی بوو؟ دەبێ چی بڵێ؟

**نەورەسی:** دەڵێ چی؟

**بەهەشت:** دەڵێ لە چەرخی (مایۆسین)دا پێش (١٠-١٥) ملیۆن ساڵ لەمەوبەر، وەچەی مرۆڤ لە وەچەی مەیمون جیابوویەوە، ئەویش لەبەر ئەوەبوو بە هۆی هەندێ گۆڕانی ئاو و هەوا و وشکە ساڵییەوە هەندێ لە درەختەکان وشکبون و میوە قڕبوو، تا لە ئەنجامدا وەچەی مرۆڤ زۆری بۆ هات و لەسەر درەختەکان دابەزی و دەستی کردە مل و مووشی سەر زەوی بۆ بەدەستهێنانی ڕۆزی، بەڵام وەچەی مەیمون هەر لەسەر درەختەکان مانەوە[١٧٤]

توخوا ئەمە وەڵامە!! یان (هەتۆل مەتۆل تەکانەیە)، ئەگەر درەختەکان وشکبون و میوە نەما، ئەی مەیمونەکان و گیاندارە

---

١٧٤ علم الإنسان، د. باقري محمد اسماعيل، چاپی ئەسکەندەریەی میسر، ١٩٧٣، ص٦٠-٦١. الإنسان بين الخلق والتطور، محمد حسن آل ياسين، بەرگی دوو، ص٢٤.

درەختییـەکانی تـر بـە چـی دەژیـان ؟ بۆچـی تـەنها ئـەو لقـەی مرۆڤەکەی پێوەبوو، وشکبوو، قڕبوو، ئەو لقەی تری مەیمونی پێوەبوو پڕبوو لە میوە و بەردار بوو؟

کێ ئەو فەرمانەی بۆ مرۆڤ دەرکرد کە ئەو میوانە تەنها بەشی مەیمونە و نابێ ئێوە لێی بخۆن و درەختەکان بەجێ بهێڵن ؟

**نەورەسی:** جا بەهەشت گیان، کەی دابەزینی سەر درەخت دەبێتە هۆی ئەو هەموو جیاوازییەی نێوان مەیمون و مرۆڤ !!

ئـەوە نییـە مـەیمونی (شـەمپازی) کـە زۆریـش دارەوانـە، کەچـی زۆربـەی کـاتی، بـەڵکو هـەموو تەمـەنی، لەسـەر زەوی و مـڵ و مووشی سەر زەوی بەسەر دەبات[١٧٥]، ئەی بۆچی نەبوو بە مرۆڤ ؟

**بەهەشت:** یان کاتێ پرسیار لە داروین دەکەیت و دەڵێی: بۆچی ملی زەڕافە درێژ بووە؟ یان بۆ ملی وشتر درێژە؟

خۆ داروین وشـەی (نـازانم) نـازانێ، هـەر ئەوەنـدەت زانـی شـەلم کوێرم خۆی پێدا ئەکێشێ و دەڵێ: باوباپیری زەڕافە وەك هەموو گیانلەرێك مل کورت بون و لەسەر ئەم زەوییە و بە گژوگیای ئەم زەوییە ئەژیان و ئەلەوەڕان، بەڵام لەبەر کەمبارانی و وشکەسالی (ئەم وشکە ساڵییە چی بوو) گژوگیای ئەو ناوچەیە وشك بوو، هـیچ چارەیەك نـەما بـۆ زەڕافـەی داماو درەختـەکان نـەبێ، وردە

---

[١٧٥] تطور الجنس البشري، د. محمد السيد غلاب، ص٨٢.

وردە پـەل و پـۆی هاویشـت بـۆ درەختـەکان دەمـی لـە پووشـە وشـکەی سـەر زەوی بـەرزکردەوە بـۆ لـق و پـۆپی درەختـەکان و ئەمیش بە نارەحەت، دەمی ئەیگەیشتێ، تا دواجار قاچەکانی کشـان (لاسـتیکە!) و ملیشـی بـەو شـێوەیە درێـژ بـوو، کـە ئەیبینی[١٧٦].

بـۆ وشـتریش دەڵـێ: "لەبەرئـەوەی گیانـداری بـڕینی سـارایە، قاچەکانی (چوار پەلی) درێژ بوو، چونکە چوار پەلی درێژ بۆ ئـەوەی ملـی بگاتـە پـووش و پەلاشـی وشترخۆرەی سـەر زەوی ملیشی درێژ بوو"[١٧٧]

جا توخوا ئەمە وەڵامی زانا و زانستە.

**تەورەسی:** کوڕە زانستی چی و تەڕەماشی چی؟ تەوەڵڵا پرسیار بکـە لـە داروین بڵـێ: جـوانی ئـافرەت و مـەمکی ئـافرەت چۆن دروستبوو؟

دەڵی: "لەبـەر ئـەوەی گیانـدارەکانی تـر، حـەزیان لـە مێینـەیە لـە دواوە، بەڵام مرۆڤ مێیینەیان لە پێشەوە ئەوێ و حـەزی لێدەکات و لەبەر ئەوەی کـە لـە جیهـانی ویژدانمانـدا وێنەیـەکی ویـژدانیی

---

١٧٦ آراء في الحياة والتطور العضوي، عزالدين تقو، ص٣١.

١٧٧ نظرية التطور واصل الإنسان، شلێمۆ موشی، ص٦٩.

جنسیمان کێشابوو (ویژدانی جنسی!) دواجار جوانی ئافرەت و مێیینەیی ئادەمیزاد بەو شێوەیە دەرچوو"[178].

ئەی ئافەرین وێنەی ویژدانی لە جیهانی خەیاڵ و ئەندێشە بیری لێبکەیتـەوە و لـە جیهـانی (واقیـع)دا و لـە بـەردەمتا هـاڵاوی لێهەڵبسێ، ئافەرین داروینیزمی بۆ خۆتان و توێژینەوەتان.

بـۆ مـەمکی ئـافرەت و شـوێنی مـەمك دەڵـێ: "سـەیر دەکـەین کۆرپەی مرۆڤ پێنج جوتە گۆ مەمکی هەیـە و دوایـی وردە وردە نامێنێ، ئەمیش ئەوەمان پیشان ئەدات کە کاتی خۆی مرۆڤیش وەك بەراز و مشك بە یەك سك چەند بەچکەی ئەبوو"[179]

کاتی خۆی مەمکی ئافرەت لەسەر سکی بوو، دوایی گوێزرایەوە بـۆ سـەر سـنگی، چـونکە ئـافرەت کـاتێ بـە پێـوە ئەڕۆیشـت کۆرپەکـەی هەڵئـەگرت و کۆرپەکـەی بە دەم ڕێگـەوە مـەمك ئـەدا، دەمـی کۆرپەکـەی نەئەگەیشـتێ، لەبـەر منالەکـە مەمکەکـەیان بـۆ گواستەوە بۆ سەر سنگی"[180]

پێویسـتە ئـەم جۆرە بابەتانـە و قسـە پیرەژنانـە ئەوەنـدە گـوێی نـەدرێتێ و نرخـی ئـەوەی نییـە پیـاو خـۆی پێـوە ماندو بکـات و وتوێـژی لەسـەر بکـات، ئەگـەرنا تـاوێ مـرۆڤ وەك مەیمونـە و

[178] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١٩٠.
[179] سەرچاوەی پێشوو، ص١٣٩.
[180] هەمان سەرچاوە، ص١٩١-١٩٢.

تـاوێکی تـر مشـك و بـەرازە !! یـان کـێ مـەمکی بـۆ ئـافرەت گواستەوە ؟

بۆچـی لـە هـەموو سەرانسـەری کـەشماڵی جیۆلـۆجی و دەستکەوتی بەردەمەنی ئاخۆ تا ئێستا یەك ئافرەت دۆزراوەتەوە کـە تاقانـە سـانتیمەترێك مـەکی لـە خـواری شـوێنی ئێسـتاوە بووبی؟

بەهەشـت: کاکـە لـەوەش گـرنگتر، ئەگـەر پرسـیار لـە داروینیـزم بکرێت کە بۆچی ڕووەك گەشەی کرد ؟

یەکسەر دەڵێ: "چونکە پێویستی ڕووەکەکە وای دەخوازێ" و دەڵێ: "کاتی خۆی ڕووەك بە شێوەیەکی سادە لە ناو دەریاکاندا دەژیـان، بـە لاسکێکی تـەڕ و ئاوییـەوە، بـە شـێوەیەك کـە هـەر تیشکێکی هەتاوی لێبکەوتایە یەکسەر وشك دەبوو، لەبەرئەوە پێویستی بە توێکڵێکی دارین بوو هەتا بیپارێزێ لە وشکبون بەو شێوەیە توێکڵەکەی بۆ پەیدابوو، ئەویش کۆچی کرد لە دەریاوە چوو بۆ دەشت و کەژ و کێو"!![181].

ئەگـەر ڕاسـتە و بـەو شـێوەیە ڕووەك گەشـەی کـردووە و وەك خۆیـان دەڵـێن لـە (گـژە دەریـا)وە گەشـەیان کـردووە، بۆچـی تـا

---

[181] هەمان سەرچاوە، ص۱۲۷.

ئێستا گژە دەریایی هەروەکو خۆی لە دۆخی خۆیدا ماوەتەوە؟ بۆچی ئەوان یاسای گەشەکردن نەیگرتنەوە؟

خۆ ئەگەر ئەم خەیاڵ پڵاوە ڕاست بوایە، ئەبوایە ئێستا کۆمەڵ کۆمەڵ و دەستە دەستە ڕووەکیان بدیایە لە دەریاوە بەرەو وشکانی کۆچیان بکردایە!!

ئەگەر داروینی باوەڕی بە گەشەکردن هەیە؛ بۆچی دەبێ گەشەکردن لە قۆناغێکدا بووەستێنێ؟

نەورەسی: ڕەنگە بەهەشت گیان ئەگەر پرسیار لە داروینیزم بکرێت کە چۆن هەنگ و هەندێ مێرووی وەك هەنگ دروستبووە؟

دوور نییە بڵێن: چونکە ڕووەك بۆ گواستنەوەی تۆوەکەی لە لایەکەوە و مشتەریی شیلەی گوڵ لە لایەکی ترەوە پێویستی پێی بێ، بۆیە دروستبووە.[182]

بەهەشت: جا کاکەگیان، خەمی ئەوەتە داروینیزم بۆ وەڵام دابمێنێ؟

نەورەسی: بەهەشت گیان، ئەگەر بمانەوێ ئەفسانە زانستییەکانی داروینیزم، ئەو داروینییەی هەموو لقەکانی زانستی (لای ئێمە) پشتگیریی دەکات، سەرژمێر بکەین، کاتێکی زۆرمان ئەوێت،

---

[182] عن الإنسان والمادية والداروينية، هادي المدرسي، ص٩٧-٩٨.

ئەفسانەی داروینی تەنها بە تاریکایی مێژووی زۆر دێرینەوە ناوەستێ، بەڵکو هەواڵی پاشەڕۆژی زۆر دوورمان ئەداتێ.

**بەهەشت:** کاکە دوور نییە، داروینی کە سەیری بن باڵی بکات و شتی پاشەڕۆژیش باس بکات!

**نەورەسی:** بەهەشت گیان، ئەو مرۆڤە داهاتووەی داروینی بیری لێدەکاتەوە، تەنانەت لە فلیمە کارتۆنییەکانیشدا بە ئەستەم دەست دەکەوێت.

**بەهەشت:** دەڵێ چی؟

**نەورەسی:** ئەو مرۆڤەی داروینیزم تاقی پێشوازیکردنی لە جیهانی (داڵغەی ژێر لێفە) و ئەندێشەدا بۆ لێداوە، ئەیەوێ پێشوازی بکات بەم شێوەیەی خوارەوە:

١. بۆشایی مێشکی مرۆڤی ئێستا نزیکەی (١٤٥٠سم$^{3}$)ە لە مرۆڤی ناوەندیدا، بەڵام داروینی ئەمەی بە لاوە کەمە و دەڵێ: "مێشکی مرۆڤ وردە وردە گەورە دەبێ، تا بۆشاییەکەی ئەگاتە (١٨٠٠-٢٠٠٠سم$^{3}$)"[١٨٣]، ئەگەر پرسیار لە داروینیزم بکەیت و بڵێی چۆن ئەتوانین بۆشایی مێشکمان فراوان بکەین ؟

دەڵێ: "ئەوە زۆر ئاسانە، چۆن زەڕافە توانی لاقەکانی درێژ بکات و ملی درێژ بکات، ئێمەش لەبەرئەوەی زیاتر پێویستمان بە

---

[١٨٣] نظرية التطور واصل الإنسان، شلێمۆ موشێ، ص٢٥١.

بیرکردنـەوە هەیـە، پێویسـتە مێشـکمان گـەورەتر بکـەین"[184]، کەواتە دەبێ کابرایەکی لادێیی نەخوێندەوار، بۆشایی مێشکی لە (٥٠-٦٠سم[3]) تێپەڕ نەکات، چونکە لەوە زیاتر پێویستی پێی نییە، بەڵام دەبێ پرۆفیسۆرێکی داروینیزمی بۆشایی مێشکی بەرمیلێك ئاو بگرێت، چونکە پێویستی پێیەتی (ئافەرین زانست و زانست و پێشکەوتن، ئافەرین).

٢. هـەمان پرۆفیسـۆر و مامۆسـتای (شـەباب)ی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاست دەڵـێ: "پێویستە منداڵدان و زێـی ئافرەت گـەورەتر بێ، چونکە کەللەسەری کۆرپەکەش گەورە دەبێ و پێویستی بە حەوز و منداڵدانی گەورەتر هەیە لە ئێستادا"[185].

٣. بەهەشت گیان، مژدە بدە بە هەموو پیرەکان کە بە ئارەزووی خۆیان جێگای قاچێکی سێیەم بۆ خۆیان دیاری بکەن، چونکە داروینی دەڵێت: "لەبەر ئەوەی ئێمە بەختیارنین بەم شێوە قنجە ئەوەستین و لە کاتی گاگۆڵکێکردنی منداڵیماندا زۆر سەرسم ئەدەین و ئەکەوین و هەڵئەستین، دیسان لە کاتی پیریمان ئەگەڕێینەوە بۆ سەرسمدان و نووچدان و چەماندنەوە، لەبەرئەوە پێویستمان بە قاچێکی سێیەم هەیە"[186].

---

[184] هەمان سەرچاوە، ص٤١.

[185] هەمان سەرچاوە، ص١٩٢.

[186] هەمان سەرچاوە، ص١٨٦.

٤. نەمانی پەنجەکانی پێ بەسەر و بەرەوە، چونکە گۆشت دایئەپۆشێت، لەبەرئەوەی پێویستیمان پێیان نییە![187].

٥. بالای مرۆڤ کورت دەبێ، بەلام ملی ئەستور دەبێ، بۆ ئەوەی بتوانێ کەللە زل و ناقولاکەی هەڵبگرێ[188].

هەروەها مووی چڕ و چاوی (پیاو یان ئافرەت) نامێنێ و ئافرەتیش قژی سەری نامێنێ[189]، ئیتر کەس نالێ: (قژ کاڵ و پەرچەم خەیاتەی خاوە) و نرخی (بارووکە) زۆر گران دەبێ.

بۆ لاقرتیکردن بە داروینی و پێکەنین بە ژیری و بلیمەتی دووکەلاوییان، منیش دەڵێم:

* ڕەنگە ڕۆڵەی ئاسمانەوانەکانی ئەمریکایی و ڕووسی پێویستیان بە گازی ئۆکسجین نەمێنێ!!

* ڕەنگە ڕۆڵەی شۆڕشگێڕەکان لە لاقەبرغەیان گیرفانێك هەر لە گۆشتی لاشەیان دروست بێ بۆ فیشەکدان، چونکە زۆر پێویستیانە!!

---

[187] هەمان سەرچاوە، ص٢٥٢.

[188] هەمان سەرچاوە، ص٢٥٣.

[189] هەمان سەرچاوە و لاپەڕە. الداروينية عرض وتحليل، يحيى محمد، ص٢٥٠.

* ڕەنگە مرۆڤ قاچی نەمێنێ، تایەی گۆشتینی لێبڕوێ بۆ ئەوەی کارامـەتر بـێ لـە بەرهـەمهێنان، چـونکە (مرۆڤـی ڕیالیسـتی شۆسیالیستییە!).

* ڕەنگە... ڕەنگە... ڕەنگە...

بەهەشـت گیـان بـە خـوا کـاتێ زانسـت کەوتـە دەسـتی جـوو و جاشـجووی چـاو برسـی، دەبـێ بـەو شـێوەیە هـەر ڕۆژەی لـە لایەکەوە کلّك و گوێی بکات، زانای ڕووسی (ویستمان) هەڵگری خـەلاّتی (نـۆبڵ) چـاکی وتـووە کـە دەڵـێ: "ئـەو بنچـینەی کـە داروینیزمی لەسەر داڕێژراوە هەموو خەیاڵ و داڵغەی دوور لە هەموو گیانێکی زانستییە و هەر لە چیرۆکە ئەفسانەکان دەچێت، کە دایکەکان بۆ خەڵەفاندنی مناڵەکانیان ئەیکەن"[190].

بەهەشـت: ئەمەیە داروینی، بەڵێ ئەمە زانسـتی زینـدەوەرزانی ئـەمڕۆی ئێمـە و ڕێبـاز و ڕامیـاریی پـەروەردەی ولاّتـی ئێمەیـە (گەڕانـەوەی مـرۆڤ بـۆ ئاژەڵ) جا جوولەکە و کوفر لەمە زیاتر چییان لە ئێمە ئەوێ؟!

پارەکــە لــە پــۆلی شەشــەمی زانســتیدا بــووم، مامۆســتای زیندەوەرزانیمان چەند باسی زیندەوەرزانی بۆ ئەکردین، ئەوەندە بگرە زیاتر باسی داروین و داروینیزمی بۆ ئەکردین[191]، داروینی

---

[190] عن الإنسان والمادية الداروينية، هادي المدرسي، ص١٥٧.

[191] سەرەتای هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو.

وەك سەلمێنراوێکی زانستی بەڵگە نەویست بۆ باس ئەکردین، خۆ کتێبەکەشمان کە پرۆگرام و پیرەوی خوێندنە و دەبێ جگە لە ڕاستی هیچ نەدات بە قوتابی، کەچی وانە بە وانە، پشتگیریی وتەی ماموستاکەمانی ئەکرد.

کاکەگیان، کتێبەکەمان زۆر کون و کەلەبەری زانستیی گەورە گەورەی تێدابوو، بەلام کاتێ ماموستامان بە لێکوڵینەوە ئەجەڕان وامان لێئەکرد خەریك بوو بەڵگەی بە دەستەوە نەئەما و ئەو هەموو چاڵ و چوڵەی پێپڕ نەئەکرایەوە بە وشەی (من هەر ئەوەندەی لێئەزانم!) دەمی ئێمەی ئەبەست .

بۆ نموونە :

١. مشەخۆری (کرمی جگەر) ژیانی لە ناو لولپێچ و جۆگەی زەرداوی جگەری مەڕدا دەستپێدەکات و بەسەر دەبات، ئایا بە پێی تیۆری داروینی کرمی جگەر لە چ قۆناغێکدا پەیدا بوو؟ لولپێچ و مەڕ هەر یەکەیان لە چ قۆناغێکدا پەیدابون؟ ئەم مشەخۆرە ئەم ماوە دوور و درێژە لە کوێ ئەژیا ؟؟

٢. ئەمیبای سکچوون، مرۆڤی لە کوێ دەستکەوت؟

٣. کرمی شریتی (ساجیناتا) مرۆڤ و مانگای لە کوێ دەستکەوت ؟

٤. مشەخۆری مەلاریا (مێیەی مێشوولەی ئەنۆفێلس) مرۆڤی لە کوێی بوو؟

ئەمانە و هەر هەموو مشەخۆرەکانی تر.

نەورەسی: بەهەشت گیان، دەڵێن: گوایە ئەمانە کاتی خۆی مشەخۆر نەبون.

بەهەشت: کاکەگیان، وا نییە، چونکە:

ئەگەر ئەم مشەخۆرانە لە پێش پەیدابونی پەتکدارەکان و ئەوانی تردا مشەخۆر نەبووبن و دوایی بووبن بە مشەخۆر، ئەمە پێچەوانەی تیۆری گەشەکردنی داروینیزمە و داروینی سەرەوخوار هەڵدەواسێ، چونکە مانای گەشەکردنی پێچەوانە

ئەبەخشێت، خۆی دەبێت لە مشەخۆرییەوە گەشە بکات بۆ (خۆژێن) نەك بە پێچەوانەوە.

٢. ئەگەر سەیری کتێبەکەی ئێمە بکەینەوە و لێی وردبینەوە، سەیر دەکەین پاش ئەوەی نزیکەی (٢٨٠) لاپەڕەیەك باسی ئەو مشەخۆرانە و پەیوەندییان بە گیاندارەکانی ترەوە دەکات، لە دواییدا دەڵێ: "بەڵام بنەچەی ئەم گیانەوەرانە هێشتا نائاشکرایە، لەوانەیە ئەو پێشینەی ئەم گیانەوەرانەی لێکەوتوونەتەوە نەرمبوو بێت و هیچ بەردبوویەکیان بەجێ نەهێشتبێت کە بتوانرێ بکرێتە بەڵگە، زاناکان شێوەی ئەم گیانەوەرانەیان وا هێناوەتە بەرچاو کە گوایە، بەڵێ گوایە ساکارە و...هتد"[192]

ئەی ئەگەر نائاشکرایە، چۆن بە گوایەیەك ئەم هەموو باس و خواسەی دروستکرد و وەك سەلمێنراوێکی بەڵگە نەویست باسیان دەکات؟ بۆچی بە قەدەر بەرەکەی خۆی پێ ڕاناکێشێت؟ ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە تا ئێستا بەڵگەیەکی زانستی نموونەییمان بە دەستەوە نییە کە ئەم مشەخۆرانە لە خۆژێنەوە هاتبن بۆ مشەخۆری .

[192] کتێبی (گیانەوەرزانی) پۆلی شەشەمی زانستی، ١٩٧٧، چاپی دووەم، ص٢٨٢.

وەك لـە کتێبێی (Text book of parasitology)[193] باسـکراوە، بەڵام ئەمان کاتێ لە پۆلدا بۆ ئێمەی بێئاگا لە بناغەی داروینیـزم و پیلانـەکانی جوولەکـەکان بـاس ئەکـەن، وەك سـەلمێنراوێکی زانستی بۆمانی باس ئەکەن و ئێمەش هەر ملّچەی دەممان دێت. کاکەگیان، خوا لە باتی من پاداشتی چاکەت بداتەوە، دەستت گرتم و لەو بیرە هەڵانە ڕزگارت کردم، چونکە زۆر کەس لای وایـە داروینی پاڵەوانبازییـەکی زانسـتییە و هەرچـی ئـەو فـەرمووی وایـە، بـۆ کـەس نییـە پەنجـەی نـا بـەرز بکاتـەوە، وا ئێسـتا بـۆم دەرکـەوت و لـێم ئاشـکرابوو کـە داروینـی پیلانێکـە بـە نـاوی زانستیەوە لەسەر گرۆی ئادەمیزادان و بۆ بەئاژەڵکردنی مرۆڤ و داڕنـینی بـەرگی مرۆڤایـەتی (وەکـو پلـەی یەکـەم) دواجـار بـۆ ڕووخـانی ڕەوشـت و ئـایین و دڕانـدنی پـەردەی نێـوان کۆمـەڵی مرۆڤایەتی و گیانداره دڕندەکان.

نەورەسی: زۆر ڕاستە بەهەشت گیـان، داروینـی یەکـەم پلـە بـوو بـۆ پیلانگێڕان و قەڵاچۆکردنی ڕەوشت، لە ئەڵقەکانی داهاتووی ئەم زیـنجیرەدا کـە باسـی (فرۆیـد و مـارکس) ئەخوێنیتـەوە گوێـت لێدەبێ و بۆت دەردەکەوێ کە چۆن داروین ڕێگای خۆشکرد بۆ مـارکس مـرۆڤ بکاتـە بەنـدەی بەرهـەم و دارایـی و لـە هـەموو

---

[193] نووسینی (داڤید لی) پرۆفیسۆری بەکتریازانی، ص٨.

مرۆڤایەتییەك بیسرپێتەوە، ڕێگای خۆشکرد بۆ فرۆید کە مرۆڤ بکاتە گیاندارێکی جنسی و هەموو ژیانی لە ڕێی جنسدا بەسەر بەرێت و ڕێی خۆشکرد بۆ دۆرکایم و مارکۆز و سارتەر و هەموو جاش جووەکانی تر.

جا لێرەدا بە خوات دەسپێرم، تا بە پشتیوانی خوا دەستدەکەین بە باسکردنی (فرۆید)ی زایۆنی خوات لەگەڵ .

سلێمانی

گەڕەکی شەهیدان

٢١/ڕەمەزان/١٤٠١ك . ٢٢/تەمموز/١٩٨١ز

# ناوەڕۆك